بیرکردنەوەیەك و هەر کارێك لەپێناو نیشتمانەکەتدا و هەر نارەزاییەك لەپێناو ئازادی دەربڕین لەوانەیە ببێتە پاسەپۆرتی مەرگت بۆ کۆتایی ژیان).

نەتەوەی تێکۆشەر پێویستی بەوێژەو شیعری بەرگری هەیە، بەو شێوەیەی کە پێویستی بەخۆراك و خواردنەوە هەیە، ئەویش دەبێ لە خزمەتی کێشە سەرەکیەکان و هیواو ئامانجەکانی لەپێناو جێبەجێبوونیدا خەبات دەکات، لەم بارەیەوە لینینی مەزن دەڵێ:(گرنگ نییە هونەر بۆ چەند کەسێك، یاخود چەند هەزارێك، لەکۆی گشتی دانیشتووان کە بەملیۆنان دەژمێردرێن تەرخان بکرێت، بەڵکو هونەر موڵکی جەماوەرە، پێویستە رەگەکانی خۆی بەقووڵی داکوتێ لەناو گیانی جەماوەری کارگەر فراوان بێتەوە، پێویستە جەماوەریش تێبگات و خۆشیبوێت، هەروەها پێویستە هەستی جەماوەر یەك بخات و هزرو ویستی بەهێز بکات).

بەڵام دەتوانین بڵێین شیعری رامیاری بەگشتی و شیعری بەرگری بەتایبەتی لە رووی هونەر و پێکهاتەوە دووچاری هەندێ کۆسپ و تەگەرە دەبێتەوە، بەڵام ئەمە گرنگ نییە چونکە ئامانجی سەرەکی شیعری بەرگری لە بنەڕەتدا لەو گوتارو بەها بەرزانە بەرجەستە دەبێت، کە بانگهێشتیان بۆ دەکات، بە جۆرێك هەموو ووشەیەك و هەموو رستەیەك تەقینەوەی مەزن و کێش و قورساییان دەردەکەوێت. لێرەدا هیچ حیسابێك بۆ لایەنە هونەرییەکانی ناکرێت بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەو هەست و هەڵچوونانەن کە ووشەکان لەدڵ و دەروونی گەلدا دروست دەکەن، بۆیە شیعری بەرگری ئامانجی هەر بریتییە نییە، لەگۆڕانکاریکردن لە زەمینەی واقیع بەڵکو لە خودی شیعر و وێژەش بە شێوەیەکی گشتی، بەجۆرێك شیعری شۆڕشگێڕی بە ئەندازەی تەنها بەرپاکردنی شۆڕشێك لەناو

شیعرەکە نابێ بەڵکو بە ئەندازەی ئەو کاریگەرییە شۆڕشگێڕانەیەی لە رووناکردنەوەی هەستی هۆشیاری لەنێو بزوتنەوەی شیعریش ئەگەر بەراستی کارێك نەکات لەگەڵ چالاکی و ئەرکەکانی شۆڕش و جەماوەر، شیعر ناتوانێ پەیڕەوی کاریگەری شۆڕشگێڕانە بکات، لەنێو جەماوەر ئەگەر لە بنەڕەتدا هونەرێکی رەسەن نەبێ، هونەری رەسەنیش هەمیشە بریتی‌یە لە شۆڕش لەناو بزوتنەوەی هونەری خۆی، بەم جۆرە شاعیرێکی وەك حاجی قادری کۆیی بە راستی و بە کردەوە باوەڕی بەبەهاو بیروباوەڕە پێشکەوتنخوازەکان هەبوو، بۆیە پەیوەندییەکی توندو تۆڵی دروست کردبوو لەنێوان بزوتنەوەی چەکداری ئازادیخواز لەلایەك و هزر وەك رێگەیەك بۆ رزگارکردنی وڵاتەکەی لەژێر چەپۆکی داگیرکەران، شاعیر لەیەکێك لە شیعرەکانی دەڵێت:-

جۆشێك بدەن وەکو هەنگ

تەگبیر بکەن بە بێ دەنگ

ئەسبابی شەڕ پەیا کەن

تۆپ و تفەنگ و هاوەن

ئینجا شاعیرمان بانگهێشتی ستەملێکراو چینی چەوساوەی سەر زەوی دەکات بۆ یەکگرتن و یەکێتی خەبات بە یەکەوە لەپێناو دەرکردنی داگیرکەرە تورکە عوسمانییەکان لەسەر خاکی کوردستان هەروەك دەڵێ:-

بێ ئەگەر دەستی یەکتری بگرن

وەك ئەسکەندەر جیهان هەموو دەگرن

بەلام (فائق بێکەس) ی شاعیر گرنگییەکی زۆری داوە بە بەرهەڵستی کردنی ئەو ئیمپریالیزمەی سەری هەڵداوە لە بۆشایی نێوان

کورد و عەرەب لە عیراقدا، بەمەبەستی داسەپاندنی دەسەلاتی خۆی بەسەر ئەو وولاتەو قۆزتنەوەی خێرو بەرهەمەکانی، بۆیە بێکەس جەخت دەکاتە سەر بیروباوەڕی برایەتی کورد و عەرەب و خۆبەخت کردن لە پێناو یەکخستنی ریزەکان و ئازاد کردنی وولات بە هەر نرخێك بێت هەر وەکو دەڵێ:-

داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ

سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ

بێکەس لەو ئاهەنگەی ساڵی ١٩٤١ بۆ رێزلێنان لە (ئەدمۆنس) راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی بەریتانیا لە عیراق سازکرابوو، ئەو بۆنەیەی بەهەلزانی و تێیدا رەخنەیەکی توندی ئاراستەی سیاسەتی حکومەتی بەریتانی لە کوردستان کرد، وای لە قەڵەمدا کەوا ئەو سیاسەتە تەنها هەڵخەتاندن و ناپاکییە بەرامبەر بە گەلی کورد، ئەم هاوارەش سەداو هەرایەکی گەورەی لەنێو جەماوەری کورد بەجێهێشت و تێیدا ویست و کۆششی ئەو گەلەی پتەوکرد کەدەڵێ:-

بیست و حەوت ساڵە من رەنجبەری تۆم

بەنان و ئاو و جل و بەرگی خۆم

پەروەردەم کردی لە ئێران و رۆم

لە پێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم

کەچی هێشتاکە دیل و رەنجەڕۆم

بەلام دلداری شاعیر شیعرەکانی بەوە ناویان دەرکرد، کەخاوەن هەناسەیەکی خەباتکەرانەی رەسەن و بانگهێشتی گەل دەکات، بۆ سەرهەڵدان و هەلگرتنی چەك لەپێناو رزگاربوون بەیەکجاری لەخوێنرێژی ئەوانەی زوڵم و ستەمی دەرخوارد دەدەن، ناودارترین

شیعرەكانی دڵدار(ئەی رەقیب)ە كە تیایدا شاعیر باس لەمێژووی دێرین و رەسەنی نەتەوەو رۆڵەكانی دەكات كەدەڵێت:-

ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی كورد زوبان
نـــایشكێنــێ دانــەری تــۆپــی زەمـــان
ئـێمـە رۆڵــەی رەنـگــی سور و شۆڕشین
سـەیـریـكە خـوێنـاوییـە رابـردوومـان.

لەدوایدا دەگەینە شاعیری گەورەمان گۆران كە زایەڵەیەكی گەورەی هەبوو، لەمەیـدانی شـیعری رامیـاری و بەرگریـدا، بەتایبـەتی لەلایـەنی سروودی نیشتمانپەروەری، كەتوانی زۆر بابەت لەم جۆرە بەرهەم بێنێ، لێرەدا بەتایبـەتی ئامـاژە بـەو هۆنراوەیـە دەكـەین، كەناونیشـانی (دەمـی راپەڕینە) بەجۆرێك كە داوا لە رۆڵەكانی گەلەكەی دەكـات، بـۆ رابـوون و رزگاری و بڕینی رێگەی تێكۆشان و شۆڕش كە دەبێژێ:

دەمــی راپــەڕینـە دەمــی راپـــەڕیـن
هـەتـاكـی بە سستی و بە پەستی بژین
پـەلامـارێ ئـەی كـورد ئـارەق رشتـنێ
لـــە دڵ كـرمـی نـاكـۆكـی دەركـــردنێ
بـەیـەك بوونە گشت، پتەو بوونی پشت!

سەرچاوە:

كمال معروف ، الحركة التجديدية

في الشعر الكوردي الحديث الجزء الاول ستوكهولم، ١٩٩٢، ص١٥٦

(*) ئـەم بابەتــە لەلایــەن (ابــراهیم علـی خـدر)ەوە بــۆ كــوردی وەرگێردراوەو لە رۆژنامەی دەنگی میللەت بڵاوكراوەتەوە.

# کێشەی دزیی ئەدەبی

**پێشەکی**

کێشەی دزیی ئەدەبی شوێنێکی فرە مەزنی لە رەخنەی ئەدەبی عەرەبی کۆندا داگیرکردووە، لەراستیدا زاراوەی دزیی زاراوەیەك نییە بۆ لۆمە کردن بەڵکو زاراوەیەکی گشتییە بەجۆرەها وەرگرتن دەگوترێت هەندێجار بۆ مەبەستی شکاندنی شاعیرو کەم کردنەوەی ڕەسەنایەتی بەکاردێت، وەرگرتن لە پێشوونان، وەرگرتن نەك بەڕێگای گواستنەوە، بەڵکو وەرگرتنی کەرەسەی سەرەتایی بۆ پیشەکەی پاشان داهێنان و ئەفراندنی تێدا بکات، کێشەی دزیی ئەدەبی، کێشەی نێوان شیعری کۆن و شیعری نوێیە، کێشەی ڕەسەنایەتییە، کێشەی لاسایی کردنەودو نوێ کردنەوەیە لەشیعردا، کێشەی کارتێکردن و کار لێ کردنە لەشیعردا.

ئەوەی پاڵی پێوەنام کە لەم باسە بکۆڵمەوە، ئەوەیە کەکێشەی دزیی ئەدەبی لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا شوێنێکی دیاری هەیەو لە ئەدەبیاتی ئەوروپیدا بەجۆرێکی تر مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، وەلەئەدەبیاتی کوردیشدا وەکو پێویست لەسەری نەنووسراوە. جا بەپێویستم زانی کە تیشك بخەمە سەر ئەم لایەنەو بۆ ئەم مەبەستەش لەباسەکەمدا هەوڵم داوە لەهەموو ڕوویەکەوە لەدزی ئەدەبی بتۆژمەوە وەکو پێناسەی دزیی، کێشەی دزیی کردن، بیروڕای رەخنەگرانی کۆن و نوێ، جۆرەکانی دزیی، دەق ئاوێزان لە ئەدەبیاتی ئەوروپیدا، جۆرەکانی دەق ئاوێزان ...هتد.

**پێناسەی دزیی شیعری:-**

ئەوەی دەست بەسەر دارایی خەڵکی تردا بگرێت پێی دەوترێت دز، هەروەها ئەوەی دەست بەسەر بیروبەرهەمی ئەدەبی دا بگرێت دیسانەوە دزە لێرەدا زاراوەی دزیی ئەدەبی بەشێوەیەکی گشتی و زاراوەی دزیی شیعریی بەشێوەیەکی تایبەتی سەری هەڵدا.

جا بزانین لەفەرهەنگەکاندا چۆن لەباسی دزیی دواون، لەفەرهەنگی (المحیط)دا بەم شێوەیە پێناسەی کراوە ((وەرگرتنی ماڵی غەیرە))[1] بەلام پێناسەی دزیی لەزاراوەی ڕەوانبێژان و ڕەخنەگران دا((ئەوەیە کە شاعیر شیعری کەسێکی تر وەربگرێت یاخود هەندێ شیعری تالآن بکات))[2] بەلام لەفەرهەنگی (المعجم المفصل في الادب)دا بەم جۆرە هاتووە (( ئەدیبێ قسەی کەسێکی تر وەربگرێت و بیکاتە موڵکی خۆی))[3] ڕەخنەگران بەشێوەی جیاواز لەباسی دزی کردن دواون. (ابن قتیبە) واژەی دزیی کردنی بەکاربردووە، (ابو الفرج الاصفهانی) لە الاغانیدا واژەی کاولکردنی بەکارهێناوە))[4] د. محەمەد مندور: واژەی دزیی کردنی بەکار بردووە))[5].

(ابن الشهید) لەچەمکی دزی شیعری گەیشتووە، لەم بارەیەوە تێگەیشتنێکی ئاشکراو ڕوونی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ووشەی (دزیی) بەکارنەهێناوە، بەڵکو گۆڕیویەتی بە ووشەی وەرگرتن، بیروڕاکانی (ابن شهید) شوێنی ڕێز لێگرتنە ئەمەش بۆئەو ڕۆشنبیرییە فراوانەی دەگەڕێتەوە کەلەئەنجامی خوێندنەوەیەکی زۆری دیوانی شاعیراندا پەیدای کردووە))[6].

گیل دولوز (Gilles Deleuze) دەڵێ:- ((دزیی کردن، غەش و لاسایی کردنەوەو ڕوونووس و چنینە لەسەر شێوازی کەسانی ترە))[٧].

**کێشەی دزیی کردنی شیعر:-**

کێشەیەکە بەشێکی زۆری کتێبی عەرەبی بەخۆوە گرتووە، تەنانەت کتابێك نادۆزیتەوە کە باسی دزی کردنی تێدا نەبێ، هەریەکەش گفتوگۆی لەسەر بابەتەکانی پێشی خۆی کردووە، شتی بۆ زیادکردووە، ڕەگی زۆر کۆنە بۆ چەرخی جاهلی دەگەڕێتەوە، دیارە گومانی تێدا نییە، کە دزی کردن بەخەوشی شاعیر دادەنرێت، لەپلەو پایەی داهێنانی دێنێتە خوارەوە، چونکە مانای وایە کە قەریحەی شیعری نییە، بێ هێزدو کەم توانایەو شارەزایی داهێنانی لاوازە.

د. محەمەد مندور دەڵێ:- ((کێشەیەکی ترسناکە، نەك لەبەر ئەوەی ڕەخنەگرانی عەرەبی پێوەی خەریك بوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی باس لە زانستی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ڕەسەنایەتی شاعیری یاخود نووسەری پێشوونان یاخود هاوچەرخانی دەکات))(٨). هەر وەکو چۆن کێشەی دزیی ئەدەبی بەندە بەرکەبەری لەنێوان لایەنگرانی شیعری کۆنو لایەنگرانی شیعری نوێدا، شاعیرانی کۆن دەڵێن پێشڕەون بۆ شاعیرانی نوێ، شاعیرانی نوێش دەڵێن تەجاوزی شیعری کۆنیان کردووە، وێنەو مانای نوێی شیعریان داهێناوە.

((ئەگەر کێشەی دزی شیعر وەکو سەرەتاو ئامانج بەرەخنەوە پەیوەست بێ، ئەوا هەندێ لە ڕەوانبێژان باوەڕیان وایە لەڕووی ناوەرۆکەوە بە ڕەوانبێژییەوە پەیوەندی دارە))(٩).

**جۆرەکانی دزیی :-**

١. النسخ (لەبەر نووسینەوە):- نەسخ لەزماندا مانای گواستنەوەی دەقێك یاخود نووسینەوەی ووشە بە ووشەی کتێبێکە.

٢. السلخ (کەولکردن):- واتە وەرگرتنی ماناو ئالوگۆڕ کردنی واژەکەی.

٣. المسخ: گوێزتنەوەی وێنەیەك بۆ وێنەیەکی ناشیرین تر.

٤. الاصطراف:- شاعیر بە بیتێك سەرسام دەبێت و دەیکا بەهی خۆی.

٥. الانتحال:- مانای وایە شاعیر شیعری شاعیرێکیتر بکا بە مولکی خۆی.

٦. الادعاء:- دزی کردنی شاعیر لەکەسێکی تر شاعیر نەبێت.

٧. النظر والملاحظة (تێڕوانین و تێبینی):- مانای وایە مانایان یەکسان دەبێ، جگە لەوەرگرتنی واژە بەنهێنی.

٨. الاختلاس (شت بەدزیی شاردنەوە):- ئالوگۆڕکردنی مانا لەمەبەستێکەوە بۆ مەبەستێکی تر.

٩. الموازنة(هاوسەنگی کردن):- وەرگرتنی بنیاتی ووشەکان.

١٠. المذمومة:- دوو جۆرە:

أ- دزیی بەئاشکرا کەواژەو مانا دەگرێتەوە لەهەموویان خراپترە.

ب- دزیی بەنهێنی کەپێویستی بە زیرەکی هەیە.

١١. الالتفاط و التلفیق:- دانانی دێرێك لەرێکخستنی چەندان دێری تر(١٠).

## هەڵوێستی ڕەخنەگرانی کۆن:-

وەرگـرتنی بـاش و وەرگـرتنی خـراپ، لەڕوانگـەی ڕەخنەگرانـەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بەدەردەکەوێ، ڕەخنـەگران بەلایانـەوە شیعر مانـاو واژەو بیرو وێنەیە.

ڕەخنـەگرانی کـۆن لـە دەربـڕینی هەڵوێسـتدا پشتیان بـەم ڕایانـە دەبەست کە وەرگرتنی بـیر، فکرەیـەکی ڕووتـە هـیچ خەوشـی تێدانـی‌یـە، چـونکە بـیر کەلـەپورێکی گشـتی‌یەو دەخرێتـە ڕوو، هـی کـەس نـی‌یـەو لەکەسـیش قەدەغـە نـی‌یـە، بـەلاَم وێنـەی تایبـەتی لـە شـیعردا، ئـەمیان لایەنی هونەری دەگرێتەوە، پەیوەندی بەخودی شاعیرەوەیە، کەهەست و بیری تێدا دەردەبڕێ، بۆیە ئەم لایەنە نابێ بگوێزرێتـەوە و وەربگیرێـت. زۆربــەی ڕەخنــەگرانی عــارەب وەرگــرتنی بیریــان بــەتاوان نــەزانیوە، لەڕوانگـەی ئـەم ڕەخنەگرانــەوە پیشــەی هونــەری پێوانەکـەی لەبــەها هونەریەکەیەتی کە داهێنان و ئەفراندنی تێدا بـەدەر دەکـەوێ. بەتـەنها بیری ڕووت کەرەسەی خاوی شیعرە، جانەگەر شاعیر بیری پێشوو یـاخود هاوچەرخ وەربگرێت هیچ نەنگی تێدا نـی‌یە مادام بەشێوەیەکی هونـەری دەیخاتە ڕوو))(١١).

(ابی هلال العسکری) دەڵـێ:- ((پێویسـتە کـە شـاعیر بـیری پێشـووی خۆی وەربگرێت))(١٢).

(الجـاحظ) دەڵـێ:- ئەگـەر سـەیری شـیعری کـۆن و نوێمـان بکـەین دەبینین یەك لەیەکتری وەردەگرێت، بەلای (جـاحظ)ەوە وەرگـرتنی مانـا شـتێکی بـاوە لەشـیعری کـۆن و نوێـدا، ئـەم وەرگرتنــەش هـیچ زیـانی

تێدانی‌یه، چونكه مانا فرێ دراوه، كه‌له‌پورێكی شیاوه بۆ هیچ كه‌س وه‌رگرتنی یاساغ نی‌یه))(١٣).

(الامدی) ده‌ڵێ:- ئه‌وانه‌ی درك به‌زانستی شیعر ده‌كه‌ن ده‌بینن كه‌دزی ماناكان هه‌ڵه‌یه‌كی گه‌وره نی‌یه))(١٤). ئه‌مه‌ش مانای وایه كه به‌لای (الامدی)یه‌وه دزیی كردنی مانا دیارده‌یه‌كی ترسناك نی‌یه، به‌ڵكو كارێكی باوی هاوچه‌رخانه‌یه.

به‌لای (ئه‌بو هلال)ه‌وه كاتێ شاعیر شیعر ده‌نووسێ ماناكه‌ی له‌ئاسمانه‌وه بۆنایه‌ت، به‌ڵكو له‌ئه‌نجامی بیركردنه‌وه‌و خوێندنه‌وه دروست ده‌بێت، بۆیه شتێكی سروشتی‌یه كه مانای كه‌م‌و زۆر بقۆزێته‌وه، مادام به‌شێوه‌یه‌كی باش وێنه‌ی بكێشێ و بیخاته به‌رچاوان))(١٥).

دیاره (ابو هلال) داهێنانی مانا به‌فرمانێكی بێ وێنه داده‌نێ، كه‌م وا هه‌ڵ ده‌كه‌وێ كه شاعیر بیرێك بدۆزێته‌وه كه پێشتر ده‌رنه‌بڕابێت، چونكه داهێنانی مانا شتێكی ئاسان نی‌یه، به‌ته‌نیا له‌زروف و ئه‌زمونی تایبه‌تی نه‌بێ بۆ هیچ شاعیرێ مه‌یسه‌ر نابێ.

مۆلێر ده‌ڵێ:- من مانای باش وه‌رده‌گرم هونه‌ری تێدا ده‌نوێنم، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا مۆرك و كه‌سایه‌تی مۆلێر دیاره. ڤیكتۆر هۆگۆ و ژماره‌یه‌ك له‌شاعیرانی تر نوێنه‌ری ڕۆمانتیكن، سه‌ره‌ڕای ئه‌مه‌ش كاره‌كانیان خاسیه‌تی تایبه‌تی هه‌یه، هیچ نه‌هێنی‌یه‌ك نی‌یه له ڕه‌سه‌نایه‌تی ئه‌م شاعیره گه‌ورانه، سه‌رپشكن له‌وه‌رگرتنی ئه‌وه‌ی ده‌یخوێننه‌وه، به‌جۆرێ ده‌بێته به‌شێك له‌بیروڕاو هه‌ست و سۆزیان))(١٦). به‌لای به‌شێكی تر له ڕه‌خنه‌گران ودرگرتنی خه‌وشدار دزیی كردنی وێنه‌یه.

القاضي الجرجاني دەڵێ:- وێنەی هونەریی نەك واژەكانی دزی كردنی خەوشدارە، چونكە واژەكان لەنێوان كەسانی هاوزماندا بەكاردێت، دزی كردنی وێنە گەورەترین تاوانە دەخرێتە پاڵ شاعیر لەم چەرخەدا))(١٧) القاضي الجرجاني ڕوونی كردەوە كەدزیی نەخۆشێكی كۆنە، شاعیرەكان یەك لەیەكتری قەریحەی شیعریان پەرەپێداوە پشتیان بەماناو واژە بەستووە، هەروەها ڕوونی كردەوە كەدزی دیاردەیەكە وەكو (توارد الخواطر) تەنیا جوداخوازی واژەی تێدایە. پاشان شاعیرە نوێخوازەكان بەگواستنەوەو وەرگەڕاندن و گۆڕین و ڕیزكردن بەرنامەیەكەیان شاردۆتەوە. (الامدی) دەڵێ:- ئەوەی سەیری ئەم كتێبە دەكات، پێویستە پەلە نەكات و بڵێ ئەوە لەمە وەرگیراوە تاكو بیر لەمانا دەكات بەبێ واژە، دزراو لەشیعردا گواستنەوەی مانایە نەك واژەكەی))(١٨) دزی واژەكان دیاردەیەكە، بەزۆری شت بەدزی شاردنەوەی پێ دەوترێت، یاخود تاڵان كردن یان ئابڕۆ بردنی پێ دەڵێن))(١٩).

نوێخوازەكان كە لەم كێشەیان كۆڵیوەتەوە بەلایانەوە دزی واژە لەسنوری دەست درێژكردنی بەرهەمی كەسانی ترو وەرگرتنی بیرەكانیان ناوەستێ، بەڵكو تێپەڕاندنی شتی تردەكات، وەكو لاسایی كردنەوە، لێ وەرگن، ڕەخنەگران پێوانەیەكیان هەبووە لەكێشەی دزیدا ئەویش ئەوەیە كەدانیان بەوەرگرتن كردووە، هەر هەمووش لەسەر ئەوە ڕێككەوتن كەدزی كردنی وێنە ناشیرین ترین دزی كردنە.

جالێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات، ئەویش ئەوەیە ئەگەر وەرگرتنی مانا خەوش نەبێ، ئەدی بۆچی ئەم هەموو نووسینانە

لەسەردزی ئەدەبی نوسراون وەڵامی ئەم پرسیارانە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە.

١. گێڕانەوەی شیعرو ئەزبەرکردنی هۆیەك بووە، بۆ پارێزگاری کردنی شیعری کۆن و بەتایبەتی شیعری جاهلی عارەبەکان زۆر درەنگ نووسینی شیعریان زانیوە، حیکایەت خوان یەکەم سەرچاوەو دوا سەرچاوە بووە بۆ ناساندنی بەرهەمی پێشوونان، لەکاتی گێڕانەوەی بابەتی ئەدەبیدا، شوێنی گواستنەوەو وەرگرتن بەدیار ناکەوێ.

٢. دان پێدانەنانی شاعیر، پاڵی بەرەخنەگرەکانەوە ناوە کە پەنجە بۆ شوێنی وەرگرتن درێژبکەن، جا ئەو وەرگرتنە وەرگرتنی بیر یاخود وێنە بێت. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە فرە کتێب لەسەر دزی شیعری بنووسرێت.

٣. شاعیران پروپاگەندەی داهێنانیان کردووە، بۆ نموونە (الصاحب بن عباد) دەڵێ:- (المتنبی) بەوە خۆشدار نابێ کە مانا لە (ابی تمام) وەردەگرێت، ئەمە دیاردەیەکی شیعری کۆن و نوێیە، بەڵکو بەوە خەوشدار دەبێ،کەپڕۆپاگەندەی داهێنان دەکات و پاکانەی ئەوە دەکات کەلە وەرگرتن بێ ئاگایە))(٢٠).

## دزیی شیعری لەڕوانگەی ڕەخنەی نوێوە.

لێرەدا بیروڕای ڕەخنەگرە نوێ خوازەکان دەخەینە ڕوو کەچۆن سەیری دزی شیعرییان کردووە، تا چەند بەبیروڕای ڕەخنەگرە کلاسیکیەکان کاریگەر بوونە.

١. د. تەها حسین:- رایەکی خێراو ناتەواوی هەیە دەربارەی دزی کردن، ڕەتی ئەوەی دەکاتەوە کە شاعیر مانا یاخود واژە لە شاعیرێکی تر

بدزێ دەڵێ: ئەمەی بەم کارە هەڵستێ شاعیر نییە دزی کردن خەوشێکی گەورەیە پێویستە شاعیر خۆی لێ دوورخاتەوە، چونکە مانای خەڵکی تر وەربگرێت و واژەکەی بگۆڕێ، هیچ شتێکی تێدانییە، لەڕاستی دا گواستنەوەیە نەك داهێنانە))(٢١).

٢. د. محەمەد مندور دەڵێ:- نابێ بڕیاری گۆترە بەسەر شاعیرەکان بدرێت، هەر وەکو کۆنەکان پەیڕەویان دەکرد، توندوتیژییان دژ بە شاعیرەکان ئەنجامدەدا، زۆرجار بڕیاری دزی کردنیان، بەسەر دەسەپاندن و هەموو شتێکیان بەدزی کردن، لەقەڵەم دەدا، پێویستە ئەو زاراوانە جیابکرێتەوە کەبەدزییەوە پەیوەندی دارن، وەکو دزی کردن، کارتێکردن، ئیلهام وەرگرتن، لێ وەرگرتن،ئەم هەموو زاراوانەی لەکتێبەکەیدا کەبەناوی (النقد المنهجی عند العرب)دا شیکردۆتەوە کە لەگەڵ بیروڕاو پرۆگرامی پێشینان جوداوازە و ناکۆکە.

بۆیە پێویستە ئەم شتانە لێکتر جودا بکرێنەوە.

١. الاستیحیاء (سروش): (مانای وایە شاعیر یاخود نووسەر لەئەنجامی خوێندنەوەی کتێبی ترمانایەکی نوێ دادەهێنێ.

٢. استعارە الهیاکل (خواستنی پەیکەرەکان): شاعیر یاخود نووسەر بابەتی قەسیدەکە یاخود چیرۆکەکە لەداستانی گەلی یان لەداستانی مێژوویی وەردەگرێت.

٣. التأثر (کارلێکردن): شاعیر یاخود نووسەر ڕێبازی هونەری یاخود شێوازي هونەری وەردەگرێت و لەوانەیە وەرگرتنێکی ناهۆشیارانە بێت.

٤. لەکۆتاییدا دزی کردن دێت، ئەویش مانای وایە کە ڕستەیەك یاخود بیرێکی بنچینەیی بدزێت و پەنجە بۆ سەرچاوەکەی درێژ نەکەیت))(٢٢).

٥. ڕاکەی د. محەمەد زەکی العشماوی نزیکە لە ڕای د.محەمەد مندور ئەویش دەڵێ: نابێ بڕیاری دزی بەسەر هەموو شتێ بدرێت بەتەنیا ئەگەر کەسی دووەم دستەواژەی یەکەمی بەتەواوی گواستەوە، بێ ئەوەی ئاماژە بەسەرچاوەکەی بکات، بەلام وێکچوونی هەندێ واژە یاخود نزیکی هەندێ مانا بەدزیدانانرێت)) د. محەمەد زەکی دەڵێ: (ابن الرومی) بەیتێکی شیعری لەدەستەواژەی حافظ وەرگرت، دەگرێ ئەوەی چاوی شیعری هەبێ، تێکەلاوی چەمکی دزی بکات و جیاوازی تا ڕادەیەك لەنێوان دزی کاریگەری و ئیلهام و لێ وەرگرتن نەکات))(٢٣).

ئەم هەموو بیروڕا جیاوازانەش رەخنەی عەرەبی دەوڵەمەندو بیرو بەخششی ئەدەبی فراوان تر کرد کەبووە هۆی لەدایك بوونی چێژی جوداوازەوە))(٢٤).

ئەو بابەتانەی کە دزی کردنی تێدا نییە.

١. مانای هاوبەش وەکو وێکچواندنی جوانی بەرۆژ و مانگ. بەخشندە بەدەریا، ئازایی بەشێر.
٢. مانای داهێنەر ئەو مانایەی کە خودی شاعیر دەیدۆزێتەوە.
٣. ئەو مانایەی شاعیر وەری دەگرێت و بۆی کەم و زیاد دەکات.
٤. ئەو مانایەی شاعیر وەری دەگرێت و بەشێوەیەکی هونەری جوان دایدەڕێژێتەوە کەلەگەڵ وێنەی یەکەمدا جوداواز دەبێت.

٥. دیسانەوە بەدزی دانانرێت، ئەگەر لەبەر نووسینەوەو ڕوونوس کردن و لەبەرگرتنەوە نەبێت.
٦. واژەی ئاڵوگۆڕکراو و ناسراو ناچێتە خانەی دزییەوە.
٧. مانای جوداواز دیسانەوە ناکرێ بەدزی دابندرێت.

**پێناسەی (التناص) دەق ئاوێزان لە ئەدەبیاتی ئەوروپیدا :-**

دیاری کردنی (التناص) دەق ئاوێزان لەلێکۆڵینەوەی ( Anniek Bouillaguet)ئەنیك بویاگیەدا بەمانای خواستنی ووتاری دانەرێکی تر نەك بەمانا خوازەکەی دێت))(٢٥).

لەلای ژولیا کریستیڤا بڕینی دەستەواژە وەرگیراوەکانی دەقەکانی تره(٢٦). ژولیا پێناسەیەکی تری دەکات و دەڵێ: ((بڕین و راستکردنەوەو ئاڵوگۆری نێوان یەکەی سەر بەدەقە جوداوازەکانە))(٢٧) لێرەدا چەمکی (Intertexte) المتناص هاتەکایەوە کە رەخنەگر (جینی) بەم جۆرە پێناسەی دەکات و دەڵێ: زۆر شت لەدەقەکان وەردەگرێت بەلام مەرکەزیەتی خۆی دەپارێزێ. کەنووسەر باوکی دەقەکەیەو لەئەنجامی گۆڕین و ئاڵوگۆڕدا دەق ئاوێزان چی دەبێ.

لەهەمان کاتدا (میشیل ئۆریفیە) دەڵێ: ئەو دەقەی هاودەقە لەگەڵ کۆی ئەو دەقانەی کەخۆی لەپەیوەندیەکی هاودەقدا دەبینێتەوە.

لەلایەکی تر تزفیتان تۆدرۆف (Tzvetan Todorov) زاراوەی دیالۆکی بەکاربردووە کە باختین بە دیالۆکی زمانەکان و ئاستە جوداوازەکانی ئاخاوتنی ناو دەبات))(٢٨)، التناص) دەق ئاوێزان بەمانای دیاری کراو ئاڵوگۆڕی نێوان دەقەکانی نووسەرانی جیاوازە دەق ئاوێزان وەك رفاندنێکی رۆشنبیری زۆر لەبیرەوانان لەسەرووی هەموویانەوە (گی

دی بـۆر) ی فەرەنسـی دەق ئـامێزان پرۆسـەی رفاندنـە، کارکردنـە، ممارەسەکردنە لەسەر دەق و گۆڕینی ڕووەکەیەتی.

بـەم جـۆرە دەق ئـاوێزان هـەر وەکـو رەخنـەگر دەڵـێ ئـامێرێکی بێزارکەرە بنیادی ووشەکانی پێ ئارام دەکاتەوە بەواتاو جوڵانەوە نوێکان دەیشلەقێنێ.

## جۆرەکانی دەق ئاوێزان لە ئەدەبیاتی رۆژ ئاوادا :-

١- التحریـر (Ver-balisation)(نووسـینەوەی دەقـی کتـابی کـە لەوەوپێش نەنووسرابێتەوە.

ئەمـەش لەسـەر شـێوەی دەقـەکان لـەنێوان جۆرەکـان و ڕەگـەزە جیاوازەکانـدا جـێ بـەجێ دەبێـت بـۆ نموونـە کلـۆد سـیمۆن ( Clud simon) لـە رۆمانەکەیـدا (جەنگی فارسال)(Bataille de phasale) وەسفی تابلۆکانی کردووە و لەسەری نووسیوە.

٢- الخطیـة (Linerisation) نووسین دیاردەیەکی نووسراوە پابەنـدە بـە بـەردەوامی ڕێزەکانـەوە، ئاسـۆیی‌یە وەکـو ئـەوەی لـە زۆربـەی زمانەکاندا بەرچاو دەکەوێ، وەك لە چینی و یابانی‌دا دەبینرێت.

پلـە بـە پلـە دەق بـۆ نووسـەر دێتـە پێشـەوەو پلـە بەپلـە بەچـەند شێوەیەك دەنووسرێتەوە، نووسەر بە ئەنقەست بەچەشنی پاکتـاوکردنی ڕەگـەزە بنەڕەتیـەکانی دەق لەگـەڵیا هـاو ئـامێز دەبـن، هاوبـەش دەبـن لەدەق و توخمە نوێکانی لەپەنتایی لاپەڕەداو لەسنووری مادیەکەیدا بـێ ئەوە سـوود لەشـتی تـر وەربگرێت. ریـزی بڕگـەکان تێـك بـداو، جـەخت لەسەر هەنـدێ دێڕ بکات بـە پـیتی جوداواز چاپی بکات، وەکـو جـۆرج

سیمون لەرۆمانەکەیدا کەپێشتر باسمان کرد چەند دێڕێ لەمارسیل برۆست وەردەگرێت.

٣- الترصیح (رازاندنەوە)(Enchassement) نووسەر بە ئەنقەست دەقی خۆی بەهەندێ ڕەگەزی کۆن دەڕازێنێتەوە.

٤- التشویش (poranomase) سەر لێشوان نووسەر بە ئەنقەست هەندێ برگە لەدەقی تەرخان کراو دەستی تێوەردەداتو و یاری پێ دەکاو دەیشوێنێ. کلۆد سیمۆن لە رۆمانەکەیدا هەندێ کۆپلەی لە رۆمانی (البحث عن الزمن الضائع) مارسیل برۆست وەردەگرێت و دەیشوێنێ.

٥- الاضمار او القطع (L'ellipse)بە جێناو کردن و فڕێدان) لێرەدانووسەر وەرگرتنی بڕاو پەیڕەو دەکات، یانی کورت کردنەوەی ئاخاوتن بەجۆرێك لەهەلگێڕانی دەق لە ڕووە ڕەسەنەکەی و ڕوویەکی تری پێ ببەخشێ، کە خوێنەر چاوەڕێ نەکات (لۆتریامون) لە پاڵەوانی مالدرودا شێوەی باو دەبڕێت.

٦- التضخیم او التوسع (l'amplification) (قەبەکردن یان فراوان کردن) لێرەدا نووسەر بە پێچەوانەی ڕەفتاری لەوەوپێش دەق دەگۆڕێ، هەڵی دەگێڕێ بەوەی کە زیاتر دەوڵەمەندی دەکات. (لۆتریامون) قوڵایی مرۆڤ ودەریای بۆدلێر فراوان دەکات و جەخت لەسەر زیانی مرۆڤ بەرامبەر دەریا دەخاتە ڕوو.

٧- القلب او العکس (L'interversion) ئەم شێوەیە بە زۆری باوە لەدەق ئاوێزاندا، بەتایبەتی لەلاسایی کردنەوەی گاڵتەجاریدا،

لۆتریامون هاودەق بووە لەگەڵ بۆدلێر، بۆنموونە بۆدلێر ڕێڕەوی بەرەو مرۆڤە، لۆتریامون بەرەو دەریای دەبات(٣٠).

٨- تغيير مستوى المعنى: ئەمەش بەگواستنەوەی مانای بۆ ئاستێکی تر، لۆتریامون لە قیامەتەکەیدا وێنەی خوانی خواکان خواردنی گۆشتی مرۆڤە.

٩- التلميح (تێل نیشان) ئەو تێل نیشانەی کە لەزەینی خوێنەردا هەڵدەقوڵێ زیاتر دەقەکەی ڕوون دەکاتەوە(٣١).

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەم دیاردە چین؟.

١- دووری ماوەی جوگرافی لەنێوان وڵاتان و کیشوەرەکاندا سەرەڕای پێشکەوتن و پەرەسەندنی هاتوچۆ، لەتوانای خاوەن بەرهەم دا نیيە ئەم کارە بە ئاسانی دابین بکات.

٢- بۆ پێشووی کۆمەڵایەتی دزی دەقەکە دەگەڕێتەوە بەتایبەتی لەجیهانی سێیەمدا، چونکە بەڕێگای تەنگ پەروەردە بووە.

٣- نەبوونی سانسۆر و پەیڕەو نەکردنی ورد لەلایەن پسپۆرانی رۆشنبیرییەوە لە رۆژنامەو گۆڤار و کتێبدا.

٤- وون بوونی تەشریعاتی یاسایی بەحەقی ئەو کەسانەی ئەم کارە ئەنجام دەدەن.

٥- بەهۆی پێشکەوتنی ڕێگای گەیاندنی پرۆگرامی رۆشنبیری لەکەناڵە جیاجیاکانی گێتیدا.

٦- هەست بە پرسیارییەتی نەکردن، بێویژدانی و دەروون لاوازی پاڵ بە نووسەرەوە دەنێت کە ئەم کارە مەیسەر بکات.

٧- وێك چوونی شارستانیتەكان بۆ نموونـە دوو شاعیر لـەدوو ژینگـەی جوداواز دەژیـن دەبیـنین لـەزۆر ڕووەوە لەشیـعرێكدا وێـك دەچـن و لێكتر نزیكن لە بۆن و بەرام و ڕەونەقی جوانیدا وەك یەكن.

## شێوەكانی ڕێگەگرتن لە پەرەسەندنی ئەم دیاردەیە:-

١. زۆر دیاردە لە كۆمەڵدا هەیە بە پێشكەوتن و پەرە سـەندنی كۆمـەڵ بەرەو نـەمان دەچێ چونكە لەولاتـە پێشكەوتوەكاندا دزی ئـەدەبی نییە ئەگەر شتێ هەبێ ئەوا ڕێژەیەكی یەكجار زۆر كەمە كەشـایانی باس كردن نییە.
٢. لیژنەیەك پێك بێـت كە بـەدوای هـەموو كـارێكی وەرگێـڕدراو چاپ كراو بچێت.
٣. ڕۆژنامەنووس بەدوای كاری دزی ئەدەبی بچێت.
٤. دادگـا بەتونـدی سـزای ئـەو كەسـانە بـدات كەبـەكاری دزی كـردن هەڵدەستن.

## بەراوردی دەقەكان:-

دیـاردەی دزی كـردن لەزانكۆكانـدا یـان لـەناو ئـەدیب و شـاعیراندا بەتایبەتی لەجیهانی سێیەمدا بەرچاو دەكەوێت، د. محەمـەد منـدور لـە (نماذج البشریة) لـە پێشـەكییەكەیدا دەڵـێ:- ئـەم كتێبـە پێشكەشـە بـە ژنەكەم، وای دەردەخات كە لەدەسكردی مەندوورە، بەلام بەخوێندنەوەی كتێبی (نموونەكانی جیهانی لە ئەدەبی فەرەنسـی و بیـانی) جـان كالفیـە كە لەساڵی ١٩٦٣ لە پاریس چاپكراوە، دەردەكەوێ كە د. محەمەد مەنـدور هـەولۆ مانـدووبونی (جـان كالفیـە)ی دزییـوەو بـەناوی خـۆی بـلاوی

کردۆتەوە بە هەندێ دەسکاری بچووکەوە، کاتێ باسکاری خوێندنی بالاّ بووم لەپاریس هاورێ (کازم جیهاد)یش پێی ڕاگەیاندم کە خەریکی چاپکردنی کتێبێکە لەسەر دزییەکانی ئەدۆنیس، دوای ئەوەی پێکەوە فەرەنسی و عەرەبییەکانمان بەراورد کرد، بۆم روون بۆوە کەقسەکانی کازم جیهاد راستە، هەندێ شتی لە ئەدەبیاتی فەرەنسی وەرگرتووە، لەبەر ئەوەی ئەدۆنیس رۆشنبیرێکی قووڵی لەسەر ئەدەبیاتی فەرەنسی هەیە، بۆیە بە ئاگایی وبێ ئاگایی لەبەرهەمەکانیدا ڕەنگیان داونەتەوە، بەڵکو بەکاری وەرگرتن و گواستنەوە دادەنرێت.

دەقێکی (الاصمعی) دەخەینە ڕوو کە ئەدۆنیس دەقاو دەق بەدەسکاریەکی کەمەوە وەری گرتووە.

دەقەکەی الاصمعی:-

خرجت حاجا الى بيت الله الحرام عن طريق الشام فبينما نحن سائرون اذ خرج علينا اسد عظيم، هائل المنظر، فقطع على الركب الطريق، فقلت لرجل بجانبي اما في هذا الركب رجل ياخذ ويرد عنا هذا الاسد، فقال اما رجلا فلا اعرف، ولكني اعرف امراة ترده من غير سيف، فقلت واين هي؟ فقام وقمت معه الى هودج قريب، فنادى يا بنية! انزلي وردي عنا هذا الاسد فقالت: يا ابت ايطيب قلبك ان ينظر الى الاسد وهو ذكر وانا انثى؟ ولكن قل له: ابنتي فاطمة تقرنك السلام وتقسم عليك بالذي لاتاخذه سنة ولا نوم لا ماعدلت عن طريق القوم قال الاصمعي: فوالله ما استتمت كلامها حتى رايت الاسد ذاهبا امامنا!(٣٢)

دەقی ئەدۆنیس

كنا حشدا كبيرا ، نساء و رجالا نسير في طريق النساء

فجأة خرج علينا فهد قطع

الطريق قلت لرجل بجانبي:

اليس هنا فارس يرد عنا

هذا الفهد؟

لا اعرف ، ولكن اعرف امراة

ترده.

اين هي؟

سار وسرت معه الى هودج قريب فنادي:

نادا، انزلي وردي عنا هذا

الفهد.

فقالت:

اطيب قلبك ان ينظر اليَّ وهو

ذكر وانا انثى؟

قل له : نادا تحييك و تامرك ان

تفتح الطريق.

فحنى الفهد راسه وغاب)(٣٣).

دەقى البيريس پێناسەی شیعری نوێ:-

اذا كنا نريد تعريفا للشعر خاص بعصرنا، ينبغي الا نبحث عنه في تقلبات الشكل، ولا في الاختفاء التدريجي لضوابط البيت، بل في وظيفة الممارسة الشعرية التي تجعل من نفسها بحثا عن حقيقة خفية ولهذا كان للشعر الحديث الحق في ان يكون غامضا مترددا، لا منطقيا، ولا يستطيع ان يستخلص أي فائدة من المصطلحات الشكلية لحاجته، على العكس الى الحرية المطلقة في التصوف و التبؤ))(٣٤).

دەقی ادونیس:-

ان الشعر الجدید، باعتباره کشف ورؤیا، غامض، متردد، لامنطقي ولهذا، لابد له من العلو على الشروط الشكلية، لانه بحاجة الى مزيد من السر و النبوة، فالشكل يمحي امام القصد و الهدف، مع ذلك فان تحديد شعر جديد خاص نبا نحن في هذا العصر، لايبحث عنه جوهريا في فوضى الشكل، ولا في التخلي المتزايد عن شروط البيت، بل في وظيفة الممارسة الشعرية، التي هي طاقة ارتياد وكشف.(٣٥).

شاعیره نوێخوازەکانی لای خۆشمان، گۆران، شێخ نوری شێخ سالح، دڵدار بە ئەدەبیاتی تورکی بەتایبەتی بە شاعیرەی گەورەی تورك(تۆفیق فیکرەت) موتەئەسیر بوونە، لەم بارەیەوە مامۆستا (ئەحمەد تاقانە) دەڵێ:-

>>وەك دەردەکەوێ تۆفیق فیکرەت، شاعیرێکی گەورەی ئەوتۆ بووە، کەئەو کەڵە شاعیرانە پەیڕەویان کردووەو کەوتونەتە ژێر ئەو بارەی کەکاری لەخۆیان و شیعریان کردووە، هەرچی شێخ نوری شێخ ساڵحە، شیعری تۆفیق فیکرەت ئەوەندە کاری لێکردووە، تەنانەت هەندێ لە شیعرەکانی بەگۆڕینەوەی دەقاودەق کردووە بە کوردی، یان کۆپلەیەکی لەلای خۆیەوە ناوەتە سەر لەوە بێدەنگ بووە، کەبڵێ ئەو شیعرە گۆڕینەوەیە، بەم جۆرە بەهی خۆی لەقەڵەم داوە، هەروەها ئەو شیعرەی (دڵدار)یش کەئاماژەمان بۆ کرد هەر دەبێ لەم خانەیەدا پۆلین بکرێ هەرچی مامۆستا (گۆران)یشە، شیعری فیکرەت وەك خۆشی باسی کردووە، زۆر کاری لێکردووە، بەڵام پیاو بۆ خودای بڵێ، بەشێوەیەکی زیرەکانەو هونەرمەندانە و شاعیرانە، هەندێکی لێ وەرگرتووە و لێی

فێربووه دیاره شاعیری بەتواناو لێهاتوو، دەتوانێ سوود لەئەدەبیاتی نەتەوەی دی وەربگرێ و لەبەرهەمی خۆیدا موتربەی بکات و بەرهەمێکی بەپێزی لێ دروست بکات<<(٣٦)، هەندێ لە شاعیره لاوەکانیشمان بەهۆی خوێندنەوەی ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسییەوه، کاریگەری و وەرگرتن بەهەندێ لەشیعرەکانیانەوه دیارن.

فیکرەت و شێخ نوری سالح:-

لەنێو شیعرەکانی شێخ نوریدا چوار شیعریان بەرچاو دەکەون کە تۆفیق فیکرەت کاری تێکردوون، بەڵکو دەگاتە رادەی گۆڕینەوەی دەقاو دەقی زۆر لایەنی و لێ وەرگرتنی زەق و دیار ئەم شیعرانەی خوارەوه ئەو سەرنجەی راکێشاوین.

گریە – خسران ناونیشانی شیعرێکی تۆفیق فیکرەتە کە دەقە تورکییەکەی بەم جۆرەی خوارەوەیە:-

گریەی خسران
گریانی نائومێدی
بگری ئەی ئەی شیعری ناتوانا بگری
هیوای دەم بە بزە لەگیانمدا مردن
ئێستا بەهەتییوه کفن لەسەر شانی بێزاری
سەر سەرییانە دەگەڕێ پەریی خەیاڵ
بگری ئەی گیانی خەم پێکاو بگری
هەستە ورشەدارەکانی ناو شیعرم کوژانەوه
ئەو هالاوانە ئەو کۆمەڵ کۆمەڵ پرپشکانە
ئێستا مشتێك خۆڵەمێشی ساردو سڕن

★ ★ ★

بگـــــری ئـــــەی چـــــارەی خـــــەزان بـگـــــری

هەڵچوونەوەم شەختەیان بەگریانەکانی ناو دڵم بەست

ئێستـــاکـــە مـــن بـــەشینـێکەوە گیرۆدەی خەزانم

گـــریـــانێکـــی دوانـــــەهـــاتـــــووم دەوێ

★ ★ ★

بگری ئـەی شیعـری نـاتـوانا بگری

بگری ئەی گیانی خەم پێکاو بگری

بگری ئـەی چارەی خـەزان بگـری

بگریـن بـەڵکو گـریان پەتایەك بێ

جـۆش و کـوڵـی گریانێکم بۆ بهێنێ(۳۷).

ناونیشانی ئەم شیعرە لـەلای شـێخ نـوری بوومتـە (رەخنـە لـەخۆو سکالا) دەقەکەی ئەمەی خوارەوەیە:-

بگری ئەی شاعری ناتەوان بگری

مرد لە رووحی منا هەموو ئامال

بـێ خـودان کفـن بـدوشـی مەلال

ئـەگەڕێ سەرسەری پەریی خەیاڵ

★ ★ ★

بگـری ئەی رووحی غەمنیشان بگری

کـــە بـــەکوللـی ئـــەمـا لـەشیعـری منا

زەرەیـــە لفظـي رێـــك و مـــەعـنـــا

وەکـو ئـــەفسـوردە ئـاگـری سـەرمـا

★ ★ ★

بگری ئەی چیهرەیی خەزان بگری

گریەی دڵ مێشکی بکا هەیەجان

بێت و گەر بکەی بەوەقفی خەزان

گریەیەکی غەریبو بێ سامان

* * *

بگری ئەی ناڵەی فیغان بگری

گریەیەکی وەها بەجۆش و خرۆش

کە نەمێنێ نەعەقڵ و نەفەهم و نەهۆش

خەرقەیی ماتەمی و ناڵە بەدۆش

* * *

بگری ئەی تەیری بێ ئامان بگری

تۆی کە چاوانی من بکەی تەمسیل

گریەیی چاوی تۆ ئەکەم بەدەلیل

وەکو تۆ خوێنی دڵ ئەکەم بە سەبیل

* * *

بگری ئەی شیعری ناتەوان بگری

بگری ئەی رۆحی غەمنیشان بگری

بگری ئەی ناڵەو فیغان بگری

بگری ئەی ئەبری بێ ئامان بگری(٣٨)

دەقی شیعرەکەی (تۆفیق فیکرەت) لەبەهار دا

لە فرانسوا قۆپەوە وەرگیراوە

بەناو شەقامی بێ سێبەر و نهێنی پەروەردا

پێکــەوە و تــەبــاو هــاو ئامـانج و هاوسەر

پڕ لە جوانی و رووناك

بێ ڕاو بکەین

من سەرواکان و تۆ پەپوولەی زەرکفت

★ ★ ★

لەدەشتەکاندا لەناو ئەو تەنیاییە خەمهێنەدا

ئاوازەکانی کامەرانی بوون وەك بەلرزێنەوە وایە

لووت بەرزی بەجێ بێڵە

بێ....... با ببیستین ..بێ

من زەمزەمەی شیعر و تۆ ئاهەنگی مەلان...

★ ★ ★

شتەکان خزمەتکاری بێ منەتی هیواکانمانن

هەموو جێیەك وەك ڕێگاکان هەڵکەوتووی دڵداریمانن

حەسوودی پێ براو و بەشکۆ

بێ ... با کۆبکەینەوە..بێ

من نیوە دێرە شیعری تەندار، تۆ گوڵی نەرموونیان

★ ★ ★

پێ زەمزەمە ، بارگەکراو بە دەروونێکی پرشنگدار

ڕۆژە هەمیشەییەکانمان با بەسەر چن نایاب و گوڵڕەنگ

تۆ شیعری تەنداریت و

من شاعیری سرووش بۆ هاتوو

تۆ جوانی و فسوون من رۆژ بە رۆژ گیرۆدەتری تۆ(٣٩).

دەقەکەی (دڵدار)ی شاعیر

بۆ ئەو کەسەی کە....

لـە بـن سایەی چەمەنزاری بەهاری

با پێکەوە بیـن یـەك دڵ و ڕوخۆش

دڵ روون و خرۆش باڕاوێ بکەین سا

هـەڵبەستـە من و تۆ دڵی پڕ جۆش

★ ★ ★

تـەنهـایـی بیـابـانێکـی پـڕ سۆز

جا لەڕێیەوە ئاوازی زەمین سوی سـرور

سا بەسیە غـرور سـاتێ ببیەیـن سـا

من نەی دمێ دڵداری و تۆ دەنگی طیور

★ ★ ★

خـدمـەتـچـی نیـازمـانە شتومەك لەژیان

تـوحفـەی دەسی دڵـداریە بـا نرخ و بەها

پـەرێـزو (معلا) کـاتـێ بچێیـن سـا

من بەستەی بەرجوستەو تۆ نێرگزی شەهلا

★ ★ ★

پـڕ زەمـزەمـە بـاغێکە زەمین تۆم هەبێ بەدەم

خۆش نەشووە چە جامێکە ژیان ساغری گۆڵگوون

تـۆ شعـری (مجسم) من شـاعیـری (ملهـم)

تۆ (حسن و فسوون)من هـەمـدەمـە مفتوون(٤٠)

**کۆتایی:**

له کۆتایی باسەکەماندا دەگەینه ئەم ئانجامانەی لای خوارەوە:-

١. جیاوازی یەکی ورد هەیه لەنێوان بیرورای رەخنەگران لەسەر کێشەی دزی ئەدەبی، چ ئەوانەی لایەنگری واژەن، یان ئەوانەی لایەنگری مانان، یاخود ئەوانەی لایەنگری هۆنینەوەن.

٢. بیرورای وورد لەنێوان رەخنەگرانی کۆن و نوێدا لەبارەی کێشەی دزی ئەدەبییەوە خۆی دەنوێنێ.

٣. مەبەستمان بریندار کردنی شاعیران نەبووە، بەڵکو دەرخستنی رەسەنایەتی وەرگرتن بووە، هەرچەندە لەهەندێ رەخنەدا شکاندنی شاعیری پێوە دیارە.

٤. رەخنەگران پێوانەیەکیان هەبووە لەکێشەی دزییدا، ئەویش کە دانیان بەوەرگرتن کردووە، بۆ داهێنانی وێنەی هونەریی، هەر هەمووش لەسەر ئەوە رێکەوتن کە دزی کردنی وێنە ناشیرین ترین دزی کردنە.

٥. دەق ئاوێزان چارەسەرێکی نوێیە لە ئەدەبیاتی ئەوروپیدا بۆ تێکەڵاوبونی شارستانیەکان و نزیك بوونەوەیان و سوود لەیەکتر وەرگرتنیان و موتربەکردنی ئەدەبی خۆماڵی کە مۆرکی تایبەتی خۆی هەبێ.

٦. رەخنەگرانی نوێ درێژەوە بووی سروشتی بیرورای رەخنەگرانی کۆنن، پێویستە دیاردەی گەرانەوە بەرەو کەلەپوور لەبەرچاو بگرین کە هۆیەکی ئەم بووژانەوە نوێیەیە، هۆیەکی بەهێزیشە لە نزیك بوونەوەو پێکەوە گرێدانی بیرورای رەخنەگرانی کۆن و نوێ لەبارەی دزی ئەدەبییەوە.

سەرچاوەکان:


١. الفيروز ابادي، القاموس المحيط ، مكتبة التراث ، ١٤٠٧هـ.
٢. د. عبدالعزيز عتيق، في النقد الادبي، دار النهضة العربية ١٣٩١ص٣١٠.
٣. د. انعام خوالي عكاوي، المعجم المفصل في الادب، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٢،ص٥٢٤.
٤. ابو الفرج الاصفهاني ، كتاب الاغاني ، دار التونسية، ١٩٨٣.
٥. د. محمد مندور، النقد المنهجي عند العرب ، دار النهضة القاهرة، ص٣٠٨.
٦. د. محمد الراية تاريخ النقد الادبي في الاندلس ، ص٤٣٤.
7. Gilles Deleuze, Dialogues, avec claire, Ed, Flammarion, Paris, 1977, P.13.
٨. د. محمد مندور ، النقد المنهجي عند العرب ، دار النهضة ، القاهرة ، ص٣٥٧.
٩. د. بدوي طبانة السرقات الادبية ، دار الثقافة ، بيروت ، ١٩٧٤، ص٦٥.
١٠. د. عبداللطيف محمد السيد الحديدي، السرقات الشعرية بين الامدي و الجرجاني في ضوء النقد الادبي القديم و الحديث، دار السعادة القاهرة، ١٩٩٥.
١١. د. حسن طبل، المعنى الشعري في التراث النقدي، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٩٨،ص٢٠٣.
١٢. ابي هلال العسكري، حققه وطبعه...د. مفيد قميحة كتاب الصناعتين، دار الكتب العلمية، بيروت ط٢، ١٩٨٤، ص١٤٦.
١٣. الحصري (ابو اسحاق القيرواني). زهرة الاداب و ثمر الالباب، دار احياء الكتب العربية،١٩٥٣،ص٦٦٦.

١٤. الامدى (الحسن بن بشر)، الموازنة بين ابي تمام و البحتري، بدون تاريخ، ص١٣١.

١٥. ابو هلال العسكري، كتاب الصناعتين، ص١٤٦.

١٦. محمد مصطفى هدارة، مشكلة السرقات في النقد الادبي، المكتبة الاسلامي ، بيروت ،١٣٠٩، هـ، ص٤٩.

١٧. القاضي الجرجاني ، تحقيق محمد ابو الفضل ابراهيم على، الوساطة بين المتنبي وخصومه، دار احياء الكتب العربية ، ط٢، ١٩٥١، ص١٨٣.

١٨. يحيى بن حمزة العلوي، الطراز ، دار المقتطف ، مصر ، ص١٨٨.

١٩. محمد مصطفى هدارة، مشكلة السرقات في النقد الادبي، المكتبة الاسلامي ، بيروت ١٣٩٠، ص٣١٠.

٢٠. الصاحب بن عباد، الكشف عن مساوئ المتنبي، مكتبة القدس ، مصر، ١٩٤٩.

٢١. عبدالحى دياب، التراث النقدى قبل مدرسه الجيل الجديد، دار الكاتب العربى، القاهره،١٩٦٨.ص٧٩.

٢٢. د. محمد مندور ، النقد المنهجى عند العرب، ص٣٠٨-٣٠٩.

٢٣. د. محمد زكي العشماوي، قضايا النقد الادبي بين القديم و الحديث، دار النهضة العربية ، بيروت، ١٤٠٤هـ، ص٣٦٤-٣٦٥.

٢٤. د. عبدالفتاح علي عفيفي، الذوق الادبي ، مطبعة الامانة، القاهرة، ١٩٨٧، ص١٢٤-١٢٥.

25. Poetique, Paris, No 8.
26. Julia Kristeva, Recherches pour une semanalyse, Ed, du Seuil, Paris, 1969.
27. Julia Kristeva,Le texte du Roman, Paris, 1976.

٢٨. كاظم جهاد ، ادونيس منتحلا، مكتبة مدبولي١٩٩٣.

٢٩. نفس المصدر السابق.

30. Lautreamont et sade, Ed, minuit, Paris, 1963.

31. Michael Riffaterre, La production du texte, Ed, du seuil, Paris, 1979.

٣٢. الوهايبي، الجسد المرئي و الجسد المتخيل في شعر ادونيس، قراءة تناصية، تونس ،١٩٨٧.

٣٣. ادونيس، الاعمال الكاملة، تحولات العاشق، دار العودة ص٥٣١.

34. R.M.Alberes, Bilan litteraire du xxsiecle, Ed, albain Michel, Paris, 1957.

٣٥. ادونيس، زمن الشعر ، دار الفكر ، بيروت ، ١٩٨٦.

٣٦. رامان ژماره ٤١، ١٩٩٩.

٣٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٨. مصلح جەلالی، شێخ نوری ، دەنگی ڕەسەنی شیعر ، بەغداد، ١٩٨٤، ل١٣٠.

٣٩. رامان ژماره ٤٢، ١٩٩٩.

٤٠. عبدالخالق علاءالدين، دڵدار شاعیرێکی شۆڕشگێڕی کورد، دار افاق العربيه، بغداد،١٩٨٥.

## چەمکی نامۆبوون لەئەدەبیاتی ئەوروپی و لە شیعری نوێی کوردیدا

### پێشەکی

لەم دواییەدا بابەتی نامۆبوون لەلایەن نووسەران و رۆناکبیرانەوە بایەخێکی یەکجار زۆری پێدراوە، خۆی لەهەموو سووچێکی چالاکی رۆشنبیری سەپاندووە، شوێنێکی بەرچاوی لەکتێبی رەخنە و شیکردنەوەی کۆمەلایەتی نوێدا داگیرکردووە، وەکو ئاستەنگێکی دیار لەکارە ئەدەبی و هونەرییەکاندا رەنگی داوەتەوە، فرە لێکۆڵینەوەی بەزمانی بیانی لەسەر نووسراوە، کە تێکرا هەوڵی چارەسەرکردنی دیاردەی نامۆبوون و توێژینەوەی چەمکی نامۆبوون و پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئەم دیاردەیە دەخەنە روو. بەلام بەزمانی کوردی شتێکی ئەوتۆ نەنووسراوە کە شایەنی باس کردن بێت، بۆیە ئێمە بە پێویستمان زانی کە تاوتۆی چەمکی نامۆبوون لەئەدەبی ئەوروپی و لە شیعری نوێی کوردیدا لەئەستۆ بگرین، و تیشك بخەینە سەر ئەدەبی ئەوروپی، کە بەهەوێن و سەرمەشق دەدەنرێن لەم بوارەدا، پاشان جەخت کردنە سەر شیعری نوێ لەناوەوەی کوردستان و لە ئاوارەیی و مەنفادا زۆر لە نووسەران و شاعیرانی شۆرشگێر بەناچاری بەرەو تاراوگەو هەندەران سەری خۆیان هەلگرت.

### پێناسەی چەمکی نامۆبوون

١ – ووشەی نامۆبوون لە زمانی ئینگلیزیدا (Alienation) ئەلیناشین و لە زمانی فەرەنسیدا (Alienation) ئەلیناسیۆنی پێ دەلێن. بنەچەیەکی لاتینییان هەیە کە لە ووشەی (Alienatio) ئەلیناتۆ وەرگیراوە<<[1].

أ – چەمکی نامۆبوون لەبواری یاساییدا لەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی‌دا بەمانای گواستنەوەی موڵکداری لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگەیەنێ.

ب – لەبواری پزیشکیدا بەمانای تێك چوونی عەقڵی‌دێت.

ج – لە بواری پەیوەندی نێوان کەسەکاندا، لەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی‌دا بە تێك چوونی پەیوەندی و دۆستایەتی نێوان دوو کەس دەوترێت.

٢ – لە زمانی ئەڵمانیدا واژەی (Entfremduag) بەمانای نامۆبوون دێت کە بەرامبەر واژەی (Alienation)ی ئینگلیزی و فەرەنسی دەوەستێ، کەمانای گواستنەوەی موڵکایەتی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر نەك بەڕێگای یاسایی‌یەوە بەڵکو لەڕێگای دەست بەسەرداگرتن و دزی کردندا، بەلآم گواستنەوەی موڵکایەتی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر ووشەی (Veroussenuag)ی پێ دەڵێن>>[٢].

نامۆبوون لەزمانی ئەڵمانیشدا بەمانای تێك چوونی عەقڵی دێت، مانای تریشی بەئەڵمانی بەنابەڵدبوونی پەیوەندی نێوان کەسەکان دەڵێن.

لەفەرهەنگی نوێ‌دا بەمانای نەمانی پەیوەندی مرۆڤایەتی‌و پەیوەندی ماددی شوێنی دەگرێتەوە، مرۆڤ وەکو دەسەلآتێکی نامۆ هەوەسی کەڵو پەلی بەسەر زاڵ دەبێ.

## نامۆبوون لەدیدو بۆچوونی جوداوازەوە

### ١ – نامۆبوون لای مارکسیەکان :-

ئەوی کە بە شێوەیەکی سەرەکی لەم دیاردەی کۆڵیوەتەوە مارکس بوو، دەستنووسەکانی ساڵی (١٨٤٤) لەسەر ئابووری سیاسی و فەلسەفی، ساڵی ١٩٣٢ بڵاوی کردوونەتەوە، هەنگاوێکە بۆ ناساندنی چەمکی نامۆبوون، ژمارەیەك لە فەیلەسوفەکان پێش مارکس چەمکی نامۆبوونیان بەکار هێناوە، هەریەکە ناوەرۆکێکی تایبەتی پێ بەخشیوە، مارکس بیری مرۆڤایەتی لێ گۆستونەتەوە، ناوەرۆکێکی نوێی پێ بەخشیوە، وەکو فەیلەسوفێکی مرۆڤایەتی نارەزایی خۆی بەرامبەر بە نامۆیی مرۆڤ و لەدەست دانی خود دەردەبڕێ، هەموو ئەو نووسینە نوێیانەی تر لەژێر کاریگەری کتابەکانی مارکس لەدایك بوون، ئەو زاراوانەی کە پێش مارکس بەکار هاتوون، زاراوەی نامۆبوونە لە کتێبی گرێبەندی دەروونی (جان جاك رۆسۆ) بەو پێیە تاك نامۆبوونی خۆی بەکۆمەڵ دەبەخشێ. یەك لەبەندەکانی گرێ بەندی کۆمەڵایەتینامۆبوونی تەواوە، لەلایەن هەر ئەندامێك کە بەشدارە لە کۆمەڵ و وازهێنانە لە سەربەستی سروشتی، بەپێی ئەو تیۆرە مافەکانی سروشتی تاك تووشی نامۆبوون دەبێو بۆ دەوڵەت دەگوێزرێتەوە، مرۆڤ کە پێشتر ئازاد و سەربەخۆ بووە، دەبێتە پاشکۆ و کۆیلەی دەوڵەت، مارکسیەت خەوش لەم تیۆریە دەگرێ و دەڵێ >>شیکردنەوەیەکی میسالیانەیە بۆ پەیدابوونی دەوڵەت، بەو پێیە بنچینەی ئابووری کۆمەڵایەتی و شێوازی چینایەتی سەرخانی سیاسی فەرامۆش دەکات<<[٢].

بەلام هیگل گفتوگۆی لەسەر زاراوەی نامۆبوون لە کتێبەکەیدا (دیاردەکانی عەقڵی تەواو) کردووە و دەڵێ، >>سروشتی مرۆڤ جووتە، تاك و کۆ خۆی دەنوێنێ، مەبەست لەسەرانسەر بنیاتی کۆمەڵایەتی‌یە بە شتێکی عەقڵی دادەنێ، وەکو بابەتی عەقڵی مرۆڤ سەیری دەکات<<[٤] پاشان دەڵێ پەیوەندی مرۆڤ بە بنیاتی کۆمەڵایەتی، پەیوەندی‌یەکی یەکەی تەواوی خێراو خۆکارە. لەهەمان کاتدا لەوانەیە ناکۆکی دروست بێ لەو کاتەدا مرۆڤ بۆ خودی خۆی دەگەڕێتەوە، بەو جۆرە تاکی جوداواز چیدەبێ تاك سەیری بنیات وەکو شتێکی تر دەکات و لێی نامۆ دەبێ، ئەو دابڕانە لە بنیاتی کۆمەڵایەتی، یەك لە ماناکانی نامۆبوونە لای هیگل. ئەم جۆرە نامۆبوونە، نامۆبوونی تر دروست دەکات، ئەویش نامۆبوونە لەخود، مرۆڤ بە بیروباوەڕی هیگل >>بنەڕەتی عەقڵە، سەرانسەری فەرمانێکی بنەڕەتی‌یە، چونکە شتی عەقڵی لەبنەڕەتەوەیە<<[٥].

مارکس ڕەخنە لە بۆچوونەکانی هیگل دەگرێت و دەڵێ :- >>مرۆڤ دیارە لە خودە، بەلام خود بەتەنیا مرۆڤ نییە<<[٦] پاشان دەڵێ :- >>بیری نامۆبوون لای هیگل نامۆبوونێکی ناڕاستەقینەیە و ئەو ڕێگایەی کە بۆ نامۆبوون پێی گەییوە بیرێکی هەڵەیە<<[٧]. (لودفیج فویرباخ) کە قوتابی (هیگل) ـە لە دەستووسەکانی مارکس دا، شوێنێکی بالای هەیە، مارکس ڕێزی بیری فیرباخ دەگرێت و دەڵێ :- >>پرۆسەی بۆ ئایین گەڕانەوە شتێکی ڕاست نییە، چونکە چەمکی نامۆبوون جیاکەرەوەی بوونی مرۆڤ نییە بەڵکو پەیوەندی بە بوونی مرۆڤەوە هەیە<<[٨].

مـاركس لـه دەسنووسـەكانیدا جـەخت لەسـەر سروشـتی مـرۆڤ و سروشتی كار دەكات و دەڵێ :- >>كاری مرۆڤ، ژیانی مرۆڤە، وزەی لـەش و گیـانی تایبـەتی كرێكـارە، كـە لەچـالاكی كـاری بەرجەسـتە دەبـێ و لـەخودی خـۆی شـتێكی نامۆدەبـێ و بـۆ كەسـێكی تـر دەچـێت<<[٩] نـامۆبوون لـە كەسـانی تـر جـۆرێكی گرنگـی نامۆبوونـە لای مـاركس و باوەڕی وایە كە ئەم جۆرە ئەنجامێكی مسۆگەرە بۆ نامۆبوونی بەرهەم و نـامۆبوونی كـار لـەم ڕووەوە دەڵـێ :- >>ئـەنجامێكی ڕاسـتەوخۆی واقیعی ئابووریيە كە مرۆڤ لەبەرهەمی كارەكەی و لە فرمانـەكانی نـامۆ دەبێ<<[١٠] چونكە لە كۆمەڵگای شارستانێتی سـەرمایەداریدا پەیوەنـدی كۆمەڵایەتی بەجۆرێكە كە مرۆڤ لەگەڵ كەسانی تر نـامۆ دەبـێ. مـاركس دەڵێ نامۆبوون شتێكی سەروەری نییە، بەهاتنە كایەی ڕژێمێكی ئابووری كۆمەڵایەتی باشتر مرۆڤ ئازاد دەبێ، كە مرۆڤیش ئازاد بوو لە نـامۆبوون ڕزگاردەبێ بە كورتی>>نەهێشتنی موڵكایەتی تایبەتی یـانی نەهێشـتنی هەموو نامۆبوونێكە<<[١١].

## ٢ – نـامۆبوون لای وجودیەكان :-

له ڕاستیدا بـیری نـامۆبوون شـوێنێكی گرنگـی لـەبیری وجودیـەكان داگیركردووە، هەموو فەیلەسوف و نووسەرەكانی وجـودی لـەو بـاوەڕەدان كـە مـرۆڤ لـەو گەردونـە فـراوان و بەرینـەدا هـیچ شـتێكی نییـە كـە پێشكەشـی بكـات، بـەڵكو زیـاتر هەسـت بەیەكـەی و نـامۆبوونی دەكـات. >>چونكە وجودیەكان بایەخ بە ژیان و بوونی واقیعـی بەڵگـەدار دەدەن و باوەڕیـان بەگەوهـەرو چـیەتی پێشـوو نییـە لـە بـوونی مرۆڤـدا، لـە ڕوانگـەی وجودیـەكان مـرۆڤ كردگـاری خـودی خۆیـەتی، سەرچـاوەی

هـەموو فرمانــەکانی لــە خــودی خۆیــەوە هــەڵقوڵاوە، خــۆی خــاوەنی چارەنووسی سەربەخۆیی خۆیەتی<<[۱۲].

فەلسەفەی وجودی بەسەر دوو چەشن دابـەش دەبـن، ئیمانـدارەکان وەکو>>فەیلەسوفی دانیمارکی سورین کیرکجورد، فەیلەسـوفی فەڕەنسـی گابرێـل مارسـیل، بێئیمانـەکانیش فەیلەسـوفی ئـەڵمانی مـارتن هیـدگر، فەڕەنسیەکانیش سیمۆن دی بوفوار و جان پۆل سارتـر، نامۆبوون لەلایان سـێجۆرە، نـامۆبوون لـەخود نـامۆبوون لــە کەسـانیتر، نـامۆبوون لــە خوداوەند.

(کیرکجـورد) فەلسـەفەکەی بەشـێکە لـە ژیـانی تـەنیایی و دوورە پەرێزی، شوڕشێکی دژبە فەلسەفەی باوی چەرخەکەی ڕاگەیاند، گاڵتـەی بەهـەموو فەلسـەفەکانی زانسـتی کـرد، کـە مـرۆڤ لـە تێگەیشتنی مانـای بوون قەدەغەدەکـەن، گـرنگ ئەوەیە بـۆ بـیری بـوون بگەڕێتـەوە کـە لـە ناخەوە بیرێکی خۆیەتی و تاکە<<[۱۳]، بەلای (کیرکجورد) ژیـانی کۆمـەڵ دابەزینە لەبوونی ڕاستی، کاریگەری لەسەر جێ دەهێڵێ >>تاك و تـەنیا بەشـتێکی پیرۆز دەزانـێ چـونکە بەهۆیـەوە دەگەینـە ڕاسـتی خـود، کـە دۆخێکی خوداوەندی هەیە<<[۱٤].

(کـارل جاسـیرز) دەڵـێ :>>بـوونی ڕەسـەن تـەنیا بـە نـامۆبوون لەکەسانی تـر جێبـەجێ دەبـێ، لەسـەر مـرۆڤ پێویسـتە بەتـەنیا ڕوو لـە خودا بکات و ژیانێك دوور لەکەسانیتر بژیت، کە پارێزگاری یەکایەتی و سەربەخۆیی لەخۆ بگرێ<<[۱٥].

(هیـدگر) دەڵـێ :- >>بـوونی ڕاسـتەقینەی ڕەسـەن، ئـەو جۆرەیـە لـەبوون، کـە بڕیـاری پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ کەسـانی تـر نییـە، بـەڵکو بڕیارەکان، بڕیاری مرۆڤن، هەڵبژاردەکانیش خۆی دیاری دەکات<<[۱٦]

(هیدگر) دەڵێ :>>بۆمان ناڵوێ درکێکی ڕاست بەمانای بوون بکەین، ئەگەر بە ئەزموونی ڕاڕایی نەڕۆین، ڕاڕایەك کە ڕاستەوخۆ نەبوونمان یاخود شیانی مردنمان بۆ دەدۆزێتەوە، مردنێك کە لە ناخی بوونمانەوەیە، ئەم شیانە جێبەجێبێ یان نەبێ لەدوارۆژێکی نزیك دا لەوانەیە لەیەك کاتدا جێبەجێبێ، ئەوا پێویستە پێی ڕازیبین، ڕازی بوونی خود بۆ بوونمان، کە بوونێکی کۆتاییە، مەرجێکی پێویستە لە بوونی ڕەسەنمان<<[١٧]، (سارتر) لە هەموو کارەکانیدا هەڵوێستێکی جێگری هەیە، بەرامبەر بەوکەسانەی کە ئازادی و بەپرسیاری تاکیان کپ دەکەن و دەڵێ >>مرۆڤ، نابێ بە مرۆڤێکی تەواو، ئەگەر درك بە توانای کەسایەتی خۆی نەکات<<[١٨]، لەبەرهەمی (بوون و نەبوون)دا دەڵێ :>>گەوهەری پەیوەندی باوی نێوان خەڵکان دووبەرەکی و ناکۆکییە هەموو خودێك هەوڵ دەدات لە دەسەلات و بەندایەتی خودی تر دەرباز بێ[١٩]، << وجودیەکان باوەڕێکی بنبڕیان هەیە کە مرۆڤ خەمۆکی قووڵە<<[٢٠]، سارتر دەڵێ :- >>ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئێمە هەست بە ڕاڕایی و خەمۆکی ناکەین یان ئەوانە لە ڕاڕایی خۆیان ڕادەکەن، فێڵ لە خودی خۆیان دەکەن، تێڕوانینی (فرۆید) لەمەڕ نامۆبوونی مرۆڤەکان بۆ چەندین کۆت و پێوەندی کۆمەڵایەتی کە هەر لە منالیەوە دەخرێنە گەردەنی مرۆڤەکان ئەم کۆت و پێوەندانە وا لە مرۆڤ دەکات کە دوورە پەرێز و نامۆ بێ<<[٢١]، (فرۆم) لە ڕوانگەی کەسایەتی خۆیەوە لەنامۆبوون دەڕوانێ، بەلایەوە نامۆبوون جۆرێکە لە تاقیکردنەوەی کەسەکە کە خۆی بە نامۆ و جوداواز لە کەسانی تر دەبینێ<<[٢٢].

**٣ – نامۆبوون لای موسڵمانەکان :-**

ئـەم جـۆرە نامۆبوونــە هاوبەشــە لـە نێـوان هـەموو مرۆڤێـك دا، هەموویان غەریبن لـە دنیـادا، دنیـا تـەنیا دەربەندێکە بۆ ئـەوەی لـەوێ بـەرەو دنیـای سـەرمەدی بچـن، >>یـاقوم انمـا الحیـاە الـدنیا متـاع، و ان الاخرة هی دار القرار<<[٢٣].

>>نامۆبوون لە ئیسلامدا مانای دوور کەوتنەوەو دابڕانە لە ژیانی کۆمەڵایـەتی، هـەموو خۆشـیو چـێژێکی ژیـان فـەرامۆش بکات، بەتـەنیا پابەنـدی ئـاییـنی ئیسـلام بـێ<<[٢٤]لـە دوارۆژدا پاداشـتێکی گـەورەی پێدەدرێ. محمد (د.خ) دەفەرموێ :- بدا الإسلام غریبا و سیعود کما بـدا فطوبی للغرباء[٢٥].

**٤ - نامۆبوون لەئەدەبی ئەوروپیدا :-**

ڕەخنــەگرو لێکۆڵــەرەوەکان لەســەدەی بیســتەهەمدا بایــەخێکی زۆریان بەم جۆرە ئەدەب دا و لێتۆژینەوەو هەڵسەنگاندنی زۆریان لەسەر کـردووە، کـوڵن ویلسـۆن ((Colin Wilson)) کتابـە بەناوبانگەکـەی (نامۆ) ساڵی ١٩٥٦ بەچاپی گەیاند، ئەم کتێبە هەرایەکی گەورەی نایـەوە، هەرایەکەشــی بــۆ ئــەو بابەتانــە دەگەڕێتــەوە کــە کتێبــی نــاوبراو خستبوونیەڕوو، وەکو نامۆ مانای چیە؟ ئـەو هۆیانـە چین کـە بوونەتـە هۆی سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە و چۆنیەتی دەربـازبوون لـەم دیاردەیـە، دیارە نامۆبوون گیرو گرفتێکی کۆنە، بەڵام پاش جـەنگی دوومـی جیهان لای لێکراوەتــەوە، ئاشــکرایە نــامۆبوون ڕەگێکــی گــەلێ کــۆنتری هەیــە، نەخۆشیەکە پەیوەندی بەخودەوەیە، داتلیشانی لـە ئـەنجامی نـەگونجانی لەگەڵ کۆمەڵەوەیە کە تێدا دەژیت، نامۆبوون لەئەدەبی واقیعی کۆنیشی

لای (بلزاك و مۆپاسان) دەبینرێن، (بلزاك) لە (کۆمیدیای مرۆڤایەتی)دا نەخۆشییەکانی کۆمەڵایەتی، لە رژدی، بەرچاوتەنگی و نزمیو دوورووییو هەروەها وێنەی کەسایەتی دوورە پەرێز و نامۆی دوور لە کۆمەڵ دەکێشێ[٣٦]، (دوستویفسکی) لەبەرهەمەکانیدا لایەنی دەروونی مرۆڤی دوورە پەرێز و دەروون پەشۆکاو دەخاتە روو کە نارەزامەندی دەردەبڕێ بەرامبەر بەو کۆمەڵەی کە تێدا ژیان بەسەر دەبات[٣٧] ئەدیب و شاعیرانی رۆمانسی لەهەموو کەس زیاتر نقوومی نامۆبوونن، کە لە بنچینەدا گیروگرفتێکی کۆمەڵایەتییە کە هەستی تاك تووشی دابڕان دەبێ، ئەدیبی رۆمانسی، ئەدیبێکی نامۆیە، کە لەجیهانی خەون و خەیاڵ دەژیت، لە واقیع ڕای کردووە، کەناری گۆشەگیری و نامۆیی گرتۆتەبەر، کۆڵن ویلسۆن لە دیاردەی نامۆبوون دەدوێ و سیماکانی دەست نیشان دەکات و تابلۆیەك لە پاڵەوانی ڕۆمانی (دۆزەخ)ی پیاوێك گوندی بەجێدێڵێ و ڕوودەکاتە شار و لەبانکی پاریس وەزیفەیەك وەردەگرێت، لە ژووری هوتێلێك بیر لە قووڵایی خودی خۆی دەکاتەوە ئارەزوی درك کردنی ڕاستییەکانیەتی لەناکاو ڕاستی جیهانی دەرەوە لەپەنجەرەچکۆڵەکەیەوە ڕوناکی ژوورێکی تەنیشتی دەبینێ، ئەم مرۆڤە نامۆیە کاتێ چاوی بە ڕاستی دەکەوێ، وێنەی بوون لە تێڕوانینیدا دەگۆڕێ، دەتلێتە خودی خۆیەوەو جیهان هیچ بەهایەکی نامێنێ<<[٢٨].

>>کەسایەتی (نامۆ) ناونیشانی هەمان چیرۆکی (ئەلبێر کامۆ)یە کە لەساڵی ١٩٤٢ بەچاپی گەیاندووە، پێش کتابی (نامۆ)ی (ویلسۆن) بە چواردە ساڵ دەرچووە، ئەوەی لە چیرۆکی (نامۆ)ی ئەلبێر کامۆدا هاتووە، تەنیا جەخت کردن و دووبارەکردنەوەی چیرۆکی (هێلنجدان)ی (سارتر)ە کە لە ساڵی ١٩٣٢ بەدەرکەوتووە<<[٣٩]پاڵەوانی چیرۆکی

(هێلنجدان) لە کەناری دەریا بەردێ دەخاتە دەریا کاتێ سەیری بەردەکان دەکات دەبینێ ترسێکی بەهێز چێدەکەن پاش ئەوەی ئەم تاقیکردنەوەیە دووبارە دەکاتەوە، بابەتێکی نامۆی لێ پەیدا دەبێ، لەناکاو ڕووی وەکو ماسێکی لێدێت<<[٢٠].

(نامۆ)ی ئەلبێر کامۆ دیمەنێکی ڕۆژی یەك شەممە خەڵکی بە ڕێگاوە بەرەو سینەما دەچوون، ڕێگاکان لەدوای خۆیانەوە چۆڵ و هۆڵ بوون، باوەڕدەکەم فلیمەکە ئەوکات دەستی پێکردبوو، کەس لەشەقام نەمابوو، تەنیا خاوەن کتێب فرۆشەکان و پشیلەیەك لە شۆستەی بەرامبەری جگەرە فرۆشێك لەسەر کورسی دانیشتبوو، کورسیەکەم لەتەنیشت جگەرەفرۆشەکە دانا و دوو جگەرەم بەبادا، پاش کەمێك ئاسمان گۆڕا، هەستم بە گەردەلولێکی هاوینی کرد، زۆری پێ نەچوو وون بوو، بەدوایەوە هەورێکی تاریك بە بروسکە و باران شەقامەکەی داپۆشی<<[٢١].

(فرانزکافکا)ی هونەرمەند هەستی بە نامۆبوونی مرۆڤ کرد لە بەرهەمەکانیدا دادگا و قەڵا ڕوونی دەکاتەوە کە بیروقراتی ڕەگەزێکی بنبڕە کە مرۆڤ لە کۆمەڵ نامۆ دەکات، خودی مرۆڤ دەبێتە پێچراوێکی مردوو بە ژمارەی پێچراوەکەی دەناسرێتەوە. کاتی مرۆڤ وەکو کەسێك بانگ دەکرێت کەس نییە بەڵکو حاڵەتێکە<<[٢٢] (نیتشە) بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕوون (نەبوونی) دیاری کردووە کە لەئەنجامی توانەوەی کۆمەڵگا چی دەبێ، بەڵام دەبوایە ئاگای لە یاساکانی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵ بوایە و دەرکی بەوە کردبا کە پەیوەندی سەرمایەداری داڕمیووە، نووسەری (العدمی) نەبوونی دەڵێ جیهانی سەرمایەداری جیهانێکی بەدبەختە، هەر ئەنجامێکی هەبێ کۆتایی دێت، هیچ سنورێك نییە بۆ

دڕندەیی ئەم جیهانە، ئەوەی پیّ وایە کە ئەم دنیایە شایانی ئەوەیە کە لە پێناوی بژی و بایەخی پێبدەی کەسێکی گەمژەیە[٣٣] (ڕافائیل ئەلبرتی) دەڵێ هەموو شیعرەکانم پەیوەندی بە مەنفاوە هەیە، ئەو شیعرانەی لە ئیتاڵیام نووسی بە تایبەتی (ڕۆماترسناکە بۆگەرۆکان، نزیکەی سێ کتابم لە ئەرجەنتین نووسی سروشتی ئەرجەنتین کارێکی قووڵی لێ کردم، مەنفا کاریگەریەکی لە نەبڕانی شیعرم جێ هێشتووە<<[٣٤] (غاوکسینغیانغ) لە شۆڕشی ڕۆشەنبیری چینی تووشی گرتووخانە بوو، لە ساڵی ١٩٨٧ بەرەو مەنفای پاریس چوو، ڕۆمانەکانی (پیاوێکی تەنیا) و (چیای گیان) باسی ژیانی ئاوارەیی و وون بوون دەکەن، خەلاتی نۆبلی پێبەخشرا حکومەتی چین بە ڕیسوا کردنی ئەدەبی چینی لەقەڵەم دا<<[٣٥].

## نامۆیی و نامۆبوون لە شیعری نوێی کوردیدا

نامۆیی لە شیعری کوردیدا ڕەگێکی گەلێ کۆنی هەیە، ڕەهەندێکی جوگرافی‌یە، پەیوەندی بە شوێن و کاتەوە هەیە، مرۆڤ کەلە وولاتەکەی خۆی نامۆبێ کە ئاوارە بوو بۆ شوێنێکی تر زیاتر تووشی نامۆیی دەبێ، سوتانی شاعیر، سۆز و کڵپەی دەرونی وەکو کانیەك دەتەقێتەوە، نامۆبوونیش بارێکی دەروونی دەگرێتەوە، جا شاعیر لە ناوەوەی کوردستان بێ یاخود لە دەرەوەی زێدەکەی بێ تووشی نامۆبوون دەبێ، باسەکەمان گەلێ پرسیار دەوروژێنێ، وەکو کاریگەری تاراوگە بەسەر شاعیرانی کوردەوە، ئەدەبی نامۆبوون لە شیعری کوردیدا وەکو پێویست سەری هەڵداوە، گۆڕینی ژینگە چ پەیوەندی بە داهێنانەوە هەیە، بێشك گۆڕینی ژینگە ئاسۆ وخەیال وبیری شاعیر فراوان دەکات، بەتایبەتی

ڕووکردنە ئەوروپا، کە تا ڕادەیەکی زۆر ئازادیەکانی مرۆڤ دابین کراوە، خۆ ڕۆشنبیرکردنیش زیاتر گومان و پرسیاری لەلا دروست دەکات و بەدوای زیادکردنی زانست و زانیاری دەکەوێ تاکو داهێنانی باشتر وبەپێزتر بە ئەنجام بگەیەنێ، تاکو داهێنانیش بالاّ تر بێ، قەبارەی پرسیارەکانی بەرەو زیادبوون دەچێ، بەمەش پاڵەپەستۆی دەروونی زیاتر دەبێ، پێم وایە داهێنانیش پەیوەندی بە چەوساندنەوە نییە، چونکە ئەو بەرهەمەی لەکەش وهەوای توندوتیژی لەدایك دەبێ، مانەوەی بەتوندو تیژی یەوە پەیوەندی دارە، بەلاّم داهینانی ئازاد پێویستی بەکەشێکی ئازادو زروفێکی ئازادەوە هەیە.

هەروەکو شێرکو بێکەس دەڵێت:- بێگومان مرۆڤ لە سەربەستیدا دەتوانیت باشتر شت بدۆزێتەوە، باشتر سەرنج بدات، لەوێوە سەرنجدانە ڕۆژهەلات هوشیارییەکی تازەتری بۆ دروست دەکات لە ڕێگای ئەو هۆشیارییە فیکرییەوە باشتر دەتوانین دەلاقەکان بۆشاییەکان، ئالوگۆڕەکانی نێو ژیانی ڕۆژهەلاّت ببینین و بیاندۆزینەوە<<[٣٦] بەشێك لە شاعیرانی تاراوگە توانیویانە شیعرەکانیان بە کاریگەری بەرهەمی جیهانی موتوربەبکەن و سوود لە ئەزموونی دوورە وولاّتی وەربگرن و هەنگاوێك ئەدەبەکەیان بەرەو پێش بەرن و وەرچەرخانێکی بەخۆوە بینیوە، شاعیریشمان هەیە لە ئاوارەیی و مەنفا دەژیت بەلاّم هیچ شوێنەوارێکی شارستانی پێوە دیار نییە، هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نەی توانیوە بچێتە نێو ڕۆشنبیری جیهانییەوە، بۆیە لەدەرەوەی بازنەکە دەخولێتەوە، خۆی دەجوتێتەوە و بەرەو خاوبوونەوە دەچێ، ئەزموونەکانی شیعری نوێی کوردی جوداوازن، بەشێکیان لەناو کوردستاندا خۆیان پێگەیاندون، بەشێکی تر لە مەنفا پەرەی بەخوێندن داوە و ئاگاداری بەرهەم و بیری

فراوانی ئەوروپین و گیانێکی نوێیان بەبەرهەمەکانیان بەخشیون، هەشمانە شێوازو تێڕوانینی لەبارەی ژیانەوە جیایە زیاتر بەرەو سۆفیزم چووە، خاڵی هاوبەش کە کۆیان دەکاتەوە، گەڕانەوەیانە بۆ شتە دێرینەکان، و یادەوەری منداڵی، بەدواداچوونی ڕووداوو کارەساتە تراژیدیەکانی کوردستانە، بەزۆری شاعیرانی کورد بەهۆی باری نالەباری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشەنبیرییەوە ڕوویان کردۆتە دەرەوە و لە وڵاتانی ئەوروپا گیرساونەتەوە، بەشێکی کەمی نەبێ بۆ مەبەستی خوێندنی باڵا و خۆ پێگەیاندن ئەوروپایان هەڵبژاردووە، ئەگینا زۆر لێکردن پاڵی پێوەناون کە بەرەو تاراوگە بچن. دیارە کەش و هەوای نوێ، فەرهەنگی نوێ، ژینگەی نوێ، نامۆبوون بەرجەستەدەکەن، جا کە شاعیر نەیتوانی خۆی لەگەڵ ئەم بارو دۆخە کە هاتۆتە ئاراوە بگونجێنێ، تووشی دوورە پەرێزیو بێزاری و وەڕزبوون دەبێتو هەست دەکات نامۆیە لەگەڵ کۆمەڵ، دەوروبەر، سروشت، زمان، لەبەرهەمەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە. بە قووڵی ڕوودەچێتە ناو ئەم ژیانە و مەینەتەکانی دووری، ئەزموونەکانی غوربەت دەخاتە ڕوو، شیعری نوێی کوردی لەدەرەوەی وڵات زۆرتر سۆزی غەمباری و ماتەمی و سوتانی شاعیری پێوە دیارە، شاعیران لەدەرەوەی وڵات تاڵ و ناخۆشی زێدەکەیان لەیاد نەکردووە، لە زۆربەی شیعرەکانیاندا، دیاردە دزێوەکانی کوردستان دەخەنە ڕوو، ڕەخنەی لێ دەگرن، خەون بە کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ دەبینن، هەردەم لە بیری گەڕانەوەن.. چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر بەم جۆرە (سینوهە)ی میسری لە بارەی ئاوارەییەوە دەنووسێ:- شاربەدەری، کۆچ کردن، وڵات بەجێهێشتن، سەرهەلگرتن، بارکردن، ئەمانە زۆر لە ئاوارە بوونیش کۆنترن، لەگەڵ ئەمەشدا بێگانە زیاتر لەخۆیان کەم دەکەنەوە بۆ ئاوارە. نەك هەوڵ بدەن تێیان بگەن،

دەمـــار تونـــدی و ناوچـــەگەرێتی تەنانـــەت ڕێگـــە لـــەوەش دەگـــرن کـــە لێکۆڵینـــەوەی زانســـتیانە لـــەبارەی نامۆبوونـــەوە بکـــرێ>>[٣٧]، (شـێرکۆ بێکـەس) لـە هـەموویان زیـاتر چڕتر و قـوڵتر چۆتە نـاخی نامۆبوونـەوە، ئەمـــەش هـــەر لـــە (دەربەنـــدی پەپوولـــە) و (خـــاج و مـــار و ڕۆژژمێـــری شاعیری)ەوە کە هەمووی نامۆیی و غوربەت و دوورولاتیان پێوە دیارە، تا دەگاتە (بۆننامـە) کـە پانتاییـەکی گـەورەی ژیـانی پڕلـە نـامۆبوونی شـاعیر دەگرێتەوە، <<لەم کارانەمدا مـن تـەنها بەجەستە لـەدەرەوەی نیشتمانم ئـەگینا وەکیتـر بـەڕوح و ڕوانـین و خـەم خولیـاو و خەیاڵـەوە هـەر لـە ناوەوەی وولاتم>>[٣٨].

(لەدەربەنـــدی پەپوولـــە)دا، تـــەنیاییو ئـــاوارەیی و ســـوتانی شـــاعیر دەبینـرێت، ئەگەرچی شـاعیر نـامۆیـە بەلـەش، بـەخاك، بـەزمان بـە هـەموو شتێك، بەلأم نامۆیی شاعیر سەرچاوەی داهێنانە و ئیلهامی شیعری جوانـە، شاعیر پەنا دەباتە بەر (با)ی (ستۆکهۆڵم) کە جەستەی لوول بداو بە خاکی کوردستانی ئاشنا بکات.

ئەگەر جار جار "با" هەڵبکات
ڕائەکەم بۆ چەند ساتێ ئەچمە بەری
ئەڵێم بەشکو ئەمجارەیان
ئا ئەم "با"یە
وەك ڕەشەبای سلەیمانی
بەبڕتاو بێو هەڵمبگرێو
تۆزی خۆڵ بکاتە چاوم ![٣٩]

دیاره كەس بە ئارەزووی خۆی بەرەو تاراوگەو مەنفا ناچێ چونكە مەنفا ئەوەندە سەخت و دژوارە ئەوەی نەیبینێ نازانێ چ دۆزەخێكە، تەبۆری (Tabori) دەڵێ :- >>ئاوارە نە لەمێشكما و نە دڵما نەنووسرابوو، بەزۆر خۆم لەوزەوییە كردەوە، كەلەسەری بووم<<[٤٠]، شێركۆ بێكەسی شاعیر بارودۆخی دژواری كوردستان ناچاری كردووە ڕێگای مەنفا بگرێتە بەر، هەرچەندە سەفەرەكەی دوورو درێژ نەبوو، بەڵام تەنیایی سوید ئەوەندە ناخۆشە مرۆڤی ئاسایی دەهاڕێ چ جای شاعیرێكی هەست ناسكی وەك شێركۆ. ناحەقی نییە ئەگەر تووشی نامۆبوون و بێزارێكی بێ وێنە بێتەوە بەجۆرێ كە تەنیایی دڵۆپ دڵۆپ لە ڕوخساری بتكێ.

ڕووبەری بەهاری كۆستێكم زۆر بەرین
هەروەكو ئەستێرەی لێقەوماو لەشەوی باراندا
هەروەكو پەنجەرەی لێقەوماو لەوەختی شكاندا
بەرانبەر TV یەك دانیشتووم
سیمام قەت ئەوەندە ئاڵودەی دڵۆپەی تەنیاییم نەبووە
دەنگم قەت ئەوەندە هۆگری باڕژنی ئاسكەكەی هەنسكم نەبووە<<[٤١]

مرۆڤ كە نقومی ئازارو مەینەتە گەورەكان بێ و جەمسەری ژیانی لێ تێك بچێ، مەرگ بەئاوات دەخوازێ، (فرۆید) دەڵێ :>>كاتێ ڕاڕایی و نامۆبوون بەرزبێتەوە پاڵ بە مرۆڤەكانەوە دەنێت بۆ خۆكوشتن<<[٤٢]، شێركۆ بێكەس لە (بۆننامە)دا وێنەی كۆمەڵە تابلۆیەكی جۆراوجۆری پڕلە كارەسات و جەرگ بڕ دەكێشێ، وەكو شەڕی ناوخۆ، گەڕانەوەی دیكتاتۆر، دوور وولاتی و تەنیایی و بێ هیوایی و بێ

ئارامی ئەم هەموو ڕووداو تراژیدیانە پەنگ دەخۆنەوە لە بۆننامەدا دەتەقێنەوە.

لەشەڕی بەردو بەردەوە
بۆنێکی نوێ بڵاوبۆوە
بۆنی ئاو وەختێ ئەکوژرێ
بۆنی کۆست وەختێ ئەکوترێ
لەماچی دەنگ و ڕەنگەوە
بۆنێکی نوێ بڵاو بۆوە
بۆنی باران ئەو وەختەی ئاڵ هەڵ ئەگەڕێ
بۆنی شەهیدیش ئەو وەختەی کە باڵ ئەگرێ(٤٣)

شاعیر ئەوەندە ناڕەحەت و نامۆیە، نامۆیی‌بوونەکەشی گەیشتۆتە دواپلەی خۆکوشتن

بەڵام من خۆم هەر خۆم بۆ خۆم لەن و دوورگەم
زەریا دەستی چەند درێژکرد
تۆڕی شەپۆلی فڕێدا و ئەوسایش نەگەیشتە نامۆییم
بۆ مردنیش
بەراوردم مەکە لەگەڵ شاخ و داخی نیشتماندا
بەرد قەت نامرێ، خۆڵ قەت نامرێ، ئاو ناکوژرێو
ئەوەی کە ئەمرێ هەر منم(٤٤)

(لەتیف هەڵمەت)ی شاعیر ناڕەزایی خۆی بەرامبەر شەڕ دەردەبڕێ، کە چ ئەنجامێکی پڕ لە مەرگەسات و ماڵ وێرانی و تێکدەرانی لێ

دەکەوێتەوە، جا ئەم شەڕە نەگریسە ئەم ڕق وکینە و گومان و متمانە بەیەکتر نەکردنە، شاعیر تووشی بێزاری و بێ ئارامی و نامۆبوون دەکات.

کوا ماچە پڕ لە بروسکەی خەندەکانت
ئەی ئاشتی شکۆمەند
کوا بۆ وەکو جاران دەست پڕ لەماچ نییە ؟
دەپردی دڵنیایی لە نێوان برا ناکۆکەکاندا
دارێژە
ئەی ئاشتی دڵ شکاو(٤٥)

لەکۆتاییدا شاعیر ڕووی دەکاتە بەرپرسیاران و پێیان دەڵێ چیتر لە پێناوی دەسەلآت و داراییدا، مامەڵە بە خوێنی یەکتر مەکەن و ڕێگای ئاشتی و تەبایی و هاریکاری بگرن کە تاکە ڕێگای پێشکەوتن و شارستانیەتە.

ئەی پردی یەکێتی و برایەتی
نەمربە نەمربە نەمر
تۆ دەتوانی تفەنگەکان بکەی بە گوڵ و
فرمێسکەکان بکەی بەخەندە
تۆ دەتوانی لوولە تۆپەکان بکەی بە گاسن و
نان و گوڵە نێرگزی پێ دروست کەیت
نان بۆ هەمووومان و
گوڵ بۆ عاشقان(٤٦)

(عەبدوڵڵا پەشێو) بروسکە چاندن کەدوا بەرهەمی عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیرە پەیامێکە بۆ تێگەیاندنی کێشەی کورد بە دنیا و

نارەزایی دەربڕینە بەرامبەر بەبراکوژی، بەبێ دەنگی جیهان، بۆ ئەمەش شاعیر هەنای بردۆتە بەر شاعیری شۆڕشگێڕی کورد حاجی قادری کۆیی، کە بە شیعرە ئاگرینەکانی جارێکیتر هۆشیاریان بکاتەوە لە ناکۆکی دووریان خاتەوەو، تاکو ڕێگای یەکێتیو تەبایی بگرنەبەر.

گوتم گەورەم
من عیسانیم
چۆن زیندووت کەمەوە بێژە ؟
گوتی لێرە دەرم بێنە
دووبەرەکی
لە شوێنەکەی من بنێژە<<(٤٧)

پەشێو بەشەوانە زۆر بیردەکاتەوە، چونکە بەرۆژ تاقەتی نییە، بۆیە بەشێکی زۆری دیوانە شیعرییەکانی ناونیشانی شەویان بەخۆوە گرتوون، (شەونییە خەوتان پێوە نەبینم)، (شەو نییە لێتان تورە نەبم)، (شەونامەی شاعیرێکی تێنو، زۆر جار شاعیران پەنایان بردۆتە بەر ئەستێرە کە لەشەوی تاریکیدا دەربازیان بکەن، کەچی پەشێوی شاعیر بە ئەستێرەکانیش نامۆیە، چونکە ئەستێرەکانی تاراوگە تۆزێ لەئازارو برینەکانی شاعیر کەم ناکەنەوە، بۆیە بەجوداوازیان دادەنێ :-

چاوم لە ئاسمان بڕیوە
گومانی ئەوسام ئێستا یەقینە
ئەستێرەناسی هەموو جیهانیش بەگژم داچن
ئەستێرەکانی دنیای هەندەران
قەت لە ئەستێرەی کوردستان ناچن(٤٨)

(فەرهاد شاکەلی) کە ڕێبوارێکی ڕێگەی تەسەوفە، لەهەردوو دیوانی ئەم دواییەدا، (نیگاری تۆ لە دیواری زیندانەکەم هەڵدەکۆڵم)، (هەموو ڕازی من ئاشکرایە و هەموو ئاشکرای تۆ ڕازە)دا ڕێبازی سۆفیزمی گرتۆتە بەر تاکو خوداوەندی تاك و تەنیا بەگەورەیی‌خۆی دڵ و دەروونی ڕوناك بکاتەوە و لە کێشەکانی کە تەنیایی و دوورە ولاتی‌یە دەربازی بکات پاك کردنەوەی دەروون گەورەترین کاری سەربازی تەسەوفە، (سەهرەوەردی) دەڵێت :- ئێمە ئەگەر بێتو خۆمان لەلەزەت وەرگرتنی لەش داماڵین<<[٤٩] نووری خودا لە دەرونمانا هەڵ دێت بۆیە سۆفی تێ‌دەکۆشێت کە ئەوەندە دڵی پاك بکاتەوە کە جێگای هیچی لێ نەبێتەوە تەنیا ببێتە جێگەی هەست و ویستی چاك و پاك، لە ڕوانگەی مەعنەوی‌یەوە دڵ ناوەندی هەست و سۆز و ویژدانی مرۆڤایەتی و باوەڕە. بۆیە پێغەمبەر (د.خ) ئەفەرموێ "قلب المؤمن عرش الرحمان"[٥٠] واتە دڵی مرۆڤی موسڵمانی ڕاستەقینە مەیدانی خودایە، کەمەبەستی نووری خودایە، جگە لە ڕوناکی خودا دڵی هیچی تیا نەمینێت، تاکو خودا بێتە مێوانی و لەدڵی جێگیر بێت، ئەمەش بەڕێگای خوداپەرستی و دەست لەهەموو خۆشیەك هەڵگرتنە، هەست کردن و تام کردن و چەشتنی ئەو خۆشی‌یە بەدڵ و دەرونە واتە چاوپێ‌کەوتن بە چاوی دڵ دەبێ کە ئەوپەڕی نزیك بوونەوەیە لە خواوەند.

بەچاوی دڵ
دەڕوانمە ولاتی ڕۆژ و سەرنجی شەوستان دەدەم،
ناوی تۆیە
لەدرزی نێوان تاریکایی و ڕوناکیدا
ئاوێنە ئاسا
وێنەی شەوو ڕۆژ دەنوێنێ<<[٥١]

زۆربەی شاعیرانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی پەنادەبەنە بەر (مەی) کە بەفریای دەردو مەینەتەکانیان بێت، مەی و مەی گێڕ لای شاعیرانی سۆفیزم وەکو ڕەمزێك بەکاردێت کەمەبەستی خواوەند دەگەیەنێ، هەستی نامۆبوون لەدیوانی (هەموو ڕازی ئاشکرایەو ...) ڕەنگی داوەتەوە، جا فەرهادی شاعیر پەنا دەباتە بەر (ساقی) و (مەی) کە دڵە گڕتوەکەی هێور ئارام بکاتەوە، ئاشکرایە فەرهاد نەك (مەی) بەڵکو چاش ناخواتەوە ئەگەر لەبەر شەکرەکەی نەبێ. لەهۆنراوەی (کەلاوەی دڵ)دا دەڵێ :-

نە پشکۆیەك<br>
نەچرایەك<br>
کەلاوەی دڵ گەرم و ڕۆشن ناکاتەوە<br>
بەم تۆف و بەم زستانە<br>
هەرچی شیعرم هەیە دەیدەمە چۆڕێ‌مەی<br>
گڕێ بەرداتە دڵ و گیان<br>
دەپێم بڵێ<br>
کوانێ ڕێگەی مەیخانە[٥٢]

(ڕەفیق صابر) لە (ژوانی ڕووناك)دا لە بارێکی گومان و گومڕایی و ڕۆحی و ڕاڕایی‌و سەرگەردانی‌و ترس‌و تەنیایی‌و نەهاتی‌دایە، نەسەرەتاو نە کۆتایی دیارنییە، زەمەنێکی وون بوو، کۆمەڵێ پرسیار لەلایەن ڕەفیق صابری شاعیرەوە ورووژێندراون، دووبارە کردنەوەی دەیان جار ووشەی تاریکی و ڕوناکی کەدوو ڕەمزی سواوەن سەراپای دیوانەکانی گرتۆتەوە بەلای‌منەوە بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە لەلایەك لەمانفاو تاراوگەدا تووشی

دابڕانی خود بووه، خودێك پێناچێت لەسوید هەست بە بوونی بکات، لەلایەکی تـرەوە ڕەگ و ڕیشـەی لـە ولآت هەڵکەنـدراوە، ناشـتوانێ لەئـەوروپا خوێنـەر پەیدا بکـات یـاخود کاریگـەری خـۆی بەسـەریاندا بسـەپێنێ بۆیـە فرێدراوەتـە دەرەوەی مێـژووی خـودی وەك (عـەتا قـەرەداغی) واتـەنی ناچـارە لەهـەموو شـتێ بێزاربـێ بەهـەموو شـتێ نـامۆبێ، لـەم کۆپلەیـەدا بەدەردەگـەوێ >>سـەرلەنوێ دەگەڕێمـەوە بـۆ پەنایەکانی ڕوح، کە پڕن لە گومان و حەسرەت، پڕن لـە پـری و بۆشـایی و ، مەودای نێـوان خـۆم و ئاینـدە بەپرسـیار دەتـەنم، مـن کـێم، لـەکوێڕا هاتووم کە سنوورەکانی نێوان بوون و نەبوونم داپۆشیوە، من چیم ؟ کە ئەم بۆشـاییەم پڕکردۆتـەوە و سـێبەرەکەم ڕواڵـەتی بوونمـە ! چـۆن ڕێـم کەوتۆتـە نـاو ئـەم قوڵاییـە ؟ هەڵـەبوو یـان سیسـتەمی تـەبایی دژەکـان، ڕێکەوت بوو یان سزا<<[٥٣]، دوای ئەوەی کۆمەڵێ پرسـیاری سەرلێشـێواو دەوروژێنێ سەرنجام هیچ شتێکی بۆ بەرجەستە نابێ تووشـی وون بـوون و نامۆبوون دەبێ، بێ هیوا لەنێو بازنەیەکی داخراودا دەمێنێتەوە.

هەردەبوو بەو دەمامکە خۆڵەمێشییەوە

خۆم ببینم کە وەك ئاگرێکی تاریك دەسوتام

هەست بەو بۆشـاییـە بـــازنـەییە بکـەم

کەلە بێئاگاییمدا

گەمارۆی دابووم[٥٤]

(قوبـاد جـەلیزادە)دیـاردەی کـۆچ کـردن کـە ڕۆژبـەڕۆژ ڕوو لـەزیاد بوونایـە خەریکـە دەبێتـە کـۆچ کردنـی هـەموو ماڵێـك دیـارە ئـەم کـۆچ کردنە، خەڵکی تووشی نیگـەرانیو ناڕەحـەتی کـردووە چ جـای شاعیران،

قوبـادی شـاعیریش هەسـتی بێـزاری خـۆی بەرامبـەر بـەم کارەسـاتە ترسـناكو خەتەرناکـە دەردەبـڕێ کـە هـۆی سەرەکیشـی بـۆ ناتـەبایی و دووبەرەکی نێوان کوردان دەگەڕێتەوە، هەروەها بێکاری و بێ ئـارامی و ترس و دڵەڕاوکێ لەگەڕانەوەی داگیرکەران و نـەبوونی متمانـە بـەدواڕۆژ ئەمانە گەلێ هۆی تر وای کردووە کە خەڵکی بەشالاو ڕوو بکەنە تاراوگە، لەم دووره ولاتیەش تووشی دەیەها گیروگرفتـی کۆمەلایـەتی و دەروونـی دەبنەوە.

هەمووشمان لە نیشتمانی بێ نان و ماچ

بێزارین

ئەم ئێوارەیە دووا تەوقە لەگەڵ یەکدی دەکەین و

ماڵئاوا

کەچی لەسەر سنووره سەرما بردووەکانا

لەناو بەلەمە بێسەرو شوێنەکانا

لەپەککەوتوخانە و مووتاشخانە و مەیخانە و مێخانە سیاحیەکانی

ئەوروپادا

پێکدەگەینەوە[٥٥]

قوباد لەدوا بەرهەمیدا کە بەناوی (هەمیشە ڕوو لەخودا هەمیشـە مەسـت)ە بچـووکترین دیـاردە دزێوەکـانی کۆمـەڵی کـوردەواری تادەگاتـە کارەسـات و ڕووداوە گـەورەکانی بەشـیعرو بەشـێوازی تایبـەتی خـۆی خستویەتیە ڕوو.

پڕاو پڕ لەپۆپیتەی گەنیوی کیژۆڵە سونەتکراوەکان

حورمەکان

وەك درەختەکان بێ هەورو بێ باخەوانن

مەمکەکان[٥٦]

(حەمە سەعید حەسەن) لەدوا بەرهەمی (نووسین بەبێ ووشە)دا تووشی بێزاری و نامۆیی بووە، کە کوخێکی کوردستان بە کۆشك و تەلاری تاراوگە ناگۆڕێتەوە، ناحەقی نییە کورد وتویەتی ئەو شوێنە خۆشە کە دڵی لێ خۆش بێ، چ لە دیمەنی جوان بکەم کە گیانی تێدا مردووبێ، جا کە شاعیر هەستی بەناڕەحەتی دڵ و گیان کرد ئارامی و ئۆقرەی لێ هەڵدەگرێ، هیچ شوێنێك بەخۆیەوە ناگرێ تەنیا زێدەکەی خۆی نەبێت.

کام کۆشکی ڕازاوەی

کام شاری دلگیری تاراوگە

ئەوەندەی کەلاوەی گوندێکی وولاتم

ئارامی دەبەخشێ بەجەستەی ماندووم و

هێمنیی بەگیانی بێ ئۆقرەم[٥٧]

(مەهاباد قەرەداغی) (لە هاژەی ڕۆح)دا کە دوابەرهەمی شاعیرە هەست بەنامۆ بوون دەکات، لەو دۆزەخەی کە تێی کەوتووە، دیارە درەختی ئاوارەیی بێ ڕەگە، چونکە ڕەگەکەی لە ولاتی غەریبیدا شین نابێ نامۆیە بە خاکەکەی، جا شاعیر پەنا دەباتە بەر ئەستێرە کە دڵۆپ

دڵۆپ خوێناوی خۆی بەسەر بپرژێنێ بەڵکو گوڵ و گەڵای داری ئاوارەیی ببوژێنێتەوە.

ئەگەر ئەمجارە هەڵهاتی، ئاوا مەبە
مەچۆرەوە ژێر پەڵەهەور
هەموو دەمێ سەرنجی ساوام بدوێنە
ئاویکی ڕوون بەسەر گوڵ و گەڵای داری ئاوارەییم ببارێنە(٥٨)

(بەختیار عەلی) لە ئەنجامی چۆڵ کردنی گوندەکانی کوردستان، خەڵکێکی زۆر بەزۆرە ملێ بۆ شارەکان گوێزراونەتەوە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی گوندێکی گەورە دروست بێ نەك شارێکی ئاسایی، سیمایەکی پاشکەوتووی هەبێ، کەلەگەڵ کۆمەڵگای شارستانێتی نوێدا نەگونجێ، بەجۆرێ شار نغرۆی بێکاری و پرچەکی بووە، بۆیە شاعیر تووشی نیگەرانی و نارەحەتی و نامۆبوون دەبێ، نەدەتوانێ بۆ ڕابردوو بگەڕێتەوە و نە لەگەڵ ئەم ژیانە دواکەوتووەشدا هەڵ بکا، جا تووشی دڵە ڕاوکێ و ڕاڕایی و بێزاری دەبێ، ئەگەر سەیری کۆمەڵگای ڕۆژهەڵات بکەین، دەبینین خاوەنی سیمایەکی پاشکەوتووە، چونکە سیاسەت باڵادەستە پشت بە ڕای گشت نابەسترێ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ نامۆبێ بەرامبەر بەم زروفە نالەبارە کە دەبێتە هۆی کۆچ کردنی خەڵك بەرەو هەندەران.

ئاه، ئەی شاری ئاوێنەبەند، بەخوێن و خەڵوزو خیانەت پڕ چەك
بەفرمێسك و عەشق و تەنهایی پڕچەك
من ئەو دەربەدەرە بێ ئیشە بووم

له سێبەری بییه کافرەکانتا ویستم پشوو بدەم
کۆچم کرد تـــا لـــه ئەفسوونی شتەکان بگەم
بەڵام لەبەردەم کڵپەکـــانــتـــا کــوێـــربــووم[٥٩]

(نـــەوزاد ڕەفعــەت) لــەدوا بەرهــەمی (هــەژانی بــەرد)دا شــاعیر وەسـتانێك لـەنێوان یـادەوەری منـداڵیو ئێسـتادا دەکـات، جـاران چـەند بەختەوەر دەبوو کە تەیارۆکەی دەگـرت و دوای تـۆزێ چێژ لێوەرگـرتن ئازادی دەکردن کەچی ئێستا هیچ شتێ زەوقـی نـەماوە چـونکە لەلایـەك ویست و ئارەزووەکانی نەهاتۆتەدی و لەلایـەکی تـرەوە بیرەوەریەکانیشی پێشـێل کـراون بۆیـە شـاعیر هەسـت بـە نارەحـەتی دەکـات و تووشـی نامۆبوون دەبێ،

ئێستا دیتنی دیمەنی (تەیارۆکە)ی
ئەم وەختانەی پایزان هیچ چێژ نابەخشن
لەدەروونندا شەوق نین و
لەخەیاڵدا ناکەنەوە پەنجەرەیێکی ئۆخژن
(تەیارۆکە)ی سوورو زەردباوو سەوزو شین
دەتلانەوە و بەدەستمانەوە دەلەرزین
پاش تۆزێ لێ وردبوونەوەش
پاش تاوێ هەوەس و خۆشیش
من بەرەڵلام دەکردنەوەو ئازارم پێ نەدەبەخشین[٦٠]

پاشـــان شـــاعیر ناســنامەی تێکــدەران ئاشـــنا دەکـــا، کـــە لەلایـــەن خاپوورانی بەهەشتییەوە ئەنجام دەدرێ کە پاشخانێکی پڕلە شەڕانگێزی

و ئەنفاليان بەدياری بۆ بەجێ هێشتووين، لەپێناوی مەداليای وون بوو دەجەنگن و هەموو جوانيەكی سروشت دەشێوێنن وەك نەيرۆن كە ڕۆمای جوانی سوتاند...

ئــــەم قۆزاخە ئارامەشيان لێ شكاندم
ئەم خانووچكە ناوازەشيان گەمارۆدام
جا خاپوركەری بەهەشتی
منداڵی و بيرەوەريی كۆن
دۆزەخی ترن يا... نيرۆن ؟[٦١]

(عەباس عەبدوڵڵا يوسف) و پشيلە، ديارە پشيلە لە كۆمەڵگای ئەوروپادا شوێنێكی تايبەتی هەيە و خاوەنی ناسنامەی خۆيەتی، موڵكايەتی تايبەتی، خەڵكی گيرۆدەی گۆشەگيری و دوورە پەرێزی و بێزاری و تەنيايی و دابران لەكۆمەڵ دەكات، بەشێكی زۆری هەست بەنامۆبوون و نيگەرانی دەكەن، بەناچاری بەدوای هاورێ دەگەرێن كە لەم ژيانە دژوارەو و پڕ مەينەتە دەربازيان بكات، بۆيە پشيلە و سەگ دەكەن بە دۆست و ژيانی لەگەڵ بەسەردەبەن، زۆر لە شاعير و ئەديبان شيعر و رۆمانيان لەسەر ئاژەڵ نووسيوە، كەچی لە كۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی دواكەوتوودا نەك ئاژەڵ بەڵكو مرۆڤيش بەهاو ڕێزی لەدەست داوە، بۆيە شاعير نامۆيە نامۆيیبوونەكەشی لە هوشياريیەوە سەری هەڵداوە لەكۆمەڵگای دواكەوتوودا هەست دەكات وەكو پێويست هيچ بايەخێكی پێ نادرێت.

ئەو ناندێنەم ناوێ

ئەو خانووەم ناوێ

ئەو گەراجەم ناوێ

ئەو شارەم ناوێ

ئەو وڵاتەم ناوێ

کەپشیلەی تیا نەبێ[٦٢]

لە پشیلە وسەگ دا فێر فەلسەفە دەبین، فەلسەفەی وەفاو دڵسۆزی و دڵنەوایی، ئەوی لەگەڵ پشیلە نەژیت نازانێ چەند زانایە، چۆن بەشداری خۆشی و ناخۆشیت دەکات، بەش بەحاڵیخۆم لەگەڵ ئەو پەندە نیم کە دەڵێ، پشیلە سپڵەیە، ئەوەندە هەیە پشیلە سەربۆکەس دانانوێنێ لەزۆرشت بەقسەی خۆی هەڵس و کەوت دەکات، لەمانگی ڕەشەمەدا جنسمان وەبیر دەهێنێتەوە.

هەرنەبێ پشیلە لەجیاتی من مشکان دەکوژێ

هەرنەبێ پشیلە ناوکە سەموونم دەخوا

هەرنەبێ پشیلە مانگی ڕەشەمەم وەبیر دێنێ

هەرنەبێ پشیلە مردە هەوەس زیندوو دەکات

هەرنەبێ پشیلە فێرە پرسی فەلسەفیم دەکا[٦٣]

(ڕۆستەم باجەلان) لەدوا بەرهەمی (غەریب)دا، کە هەمووی قەسیدەیەکی درێژە بەناوی (غەریب)، لەنامۆبوون دەدوێ، کۆمەڵە تابلۆیەکی جۆراوجۆرە لەکارەسات و تراژیدیانەی کەبەسەر گەلەکەمان هاتووە، وێنەکان دەتەقنەوە، شاعیریش تووشی ڕامان و نامۆبوون دەبێ،

لەیەکێك لە تابلۆکان بەراوردێك لە نێوان منداڵانی دنیا و منداڵی کورد دەبینرێ، هەست دەکا کە منداڵان لە دنیای دەرەوە هەموو شتێکیان بۆ دابین کراوە، لەوپەڕی خۆشی شادی‌دان، کەچی لای ئێمە لەماڵی خۆی ئاوارەیە، لە کوردستانی خۆی ئاوارەو دەربەدەرەو لەسەر شەقام و کۆڵانەکاندا خەریکی فرۆشتنی جگەرەو کاسبی‌کردنن، ناحەقی نییە کە شاعیر تووشی نامۆیی ببێ، چونکە نەوەی دوا ڕۆژ کەمنداڵە بەوشێوەیە پەروەردەبێ،

کەدەست بۆ خامەکەم دەبەم
ملیۆنەها منداڵی ئاوارەی
ڕەش و
سپی
تێم دەوروکێن
لەبەر چاوما دەڕۆن و دێن
داوام لێدەکەن وێنەی غەریب ناویان بکێشم
ڕوحێکی کۆپی کراو، لەتەنی چارەنووس
دوارۆژیان هەلکێشم(٦٤)

نامۆبوون حاڵەتێکی دەروونی‌یە، مرۆڤ تووشی دیاردەی نامۆبوون دەبێ، چ لە کوردستان بێ یاخود لە تاراوگەو مەنفا بێ، نامۆبوونی کوردستانیش پەیوەندی بەو زروفە سیاسی وئابووری و کۆمەلایەتی یەوە هەیە کە بەسەر کوردستاندا تێدەپەرێ، دوارۆژی دیار نییە، جەمسەری شتەکان ئاڵۆزن، جا زۆر شتێکی ئاسایی‌یە کە شاعیر هەست بەنامۆبوون بکات.

ئەمرۆ دوێنێ نییە
هەرلێرەشەوە گوێم لە زایەڵەی دەنگێکەوە گرتووە
بەنامۆییەوە ئەم گۆرانییە لەبەرخۆیەوە دەچڕێ
ئەگەر لێرەبم یان لەوێ
ئەوا هەرغەریبم، غەریب
نەسەرەتام دیارە، نەکۆتایی
نەخاکم هەیە، نەئاوایی[٦٥]

(کەریم دەشتی) لەدوا بەرهەمی (پیانۆی رۆژهەلآت)دا، چەند قەسیدەیەکی وەکو (هەلآلتر لەشیری دایك)، (ئەی دژوارترین دۆست)، (شەقامی ئاسمان)، (تائەبەد خاچ)دا، شاعیر تووشی نامۆبوون بووە بەرامبەر بەخاپووکەرانی بەهەشتی کە ئەم هەموو خراپەیان ئەنجام داوە، جوانی منداڵیان شێواندوە، لەسایەی ئەوانەوە ژیان بەدۆزەخ وزیندان دەزانێ،

من هێندە موبتەلات نیم ئەی سەرشار لە جودایی
چونکە هەموو ئەو تەمەنەم لە مەنفای ئەم
جوداییە بەڕێکرد
ئەی خۆشترین زیندان
ئەی زیندانی ترین خۆشی
وەرە شمشێری دەستت فڕێدە
بابچینەوە تەمستانی بخوری کڵێساو ئاوێنەی بەهەشتی[٦٦]

شاعیر بێزارە لەو هەموو ناخۆشیەی تێی کەوتووە، بۆ ئەمەش پەنای دەباتە بەر مەی کە بەفریادی بێ تۆزێ ئارامی بکاتەوە،

ئەی دژوارترین دۆست وئەی دادرەسترین پەنجەرە
نزانم من ئێستـــا ئـــەو دڵەم لە عیشق چکی کرد
جەستەشم تەژی بـــوو لـــەگـــەڵای ڕژیوی بێزاری
فریام کەوە ئەی داد ڕەستـــرین جـــامی خودایی(٦٧)

(چـــنوور نـــامیق حەســـەن) شـــاعیر بەدەســـت ئـــازار وجـــەنگ وکەرەساتەکانەوە نامۆیە، نـازانێ سەری خۆی بۆ کوێ هەڵ بگرێ ڕوو بکاتە کوێ شەڕ هەموو شوێنێکی وولاَتی تـەنیوە، بەناچاری خـەڵکی لـە مەنفایەکـەوە بـەرەو مەنفایـەکی تـر خـەریکی سـەفەر کـردنن ولـە بازنەیەکدا دەخولێنەوە.

کۆچ بەرەو کوێ ترس کوچەری ترین هەستە
لەدامێنی ئەم بارانە بازانەیی بانە
ڕێگاکان هەنگاوی برسی ماچ ئەکەن
کێ لە هەڵقولێنی ڕێ ئەکا
ئەی ئێمە بخزێنە بن کام بەردەوە
تا ناوی لێ بنێین وولاَت(٦٨)

دیـارە لەبـەر بـێ ئـارامی ونارەحـەتی وولاَت باڵنـدەکانیش وولاَت بەجێ دەهێڵن بەرەو شوێنی نادیار خۆ دەرباز دەکـەن حـاجی لـەق لـەق منـارەی چۆلی بەجێهێشت وبڕیاری داوە تـاکو ئاشـتی لـە سەرانسـەری وولاَت سەقامیگر نەبێ نەگەڕێتەوە.

خۆدەرباز کەین
تەنانەت باڵندەکانیش
جارێکی دی بۆ بناری ژانە چیاییەکانی
حەسرەت نایەنەوە[٦٩]

(پشکو نەجمەددین) دوا بەرهەمی (لەتێك غوربەت لەتەمەندا)دا پڕن لە سۆزی غوربەت ونامۆیی، تاراوگە لای شاعیر مەرگەساتە، بێزاریو تەنیایی‌یە، بۆیە جانتای دەپێچێتەوە بەرەو کوردستان دەگەڕێتەوە، لە گەڕانەوەیدا تووشی بێ هیوایی ونامۆیی دەبێت، نامۆ لە هەموو شتو دیاردەکانی کۆمەڵ.

جانتای شانی گەڕانەوەم تەواو خاڵیی
نەرازێکی دەم بەبزە
نەتاڵێك پرچی دایکم ونەمشتێك خاکی نیشتمان
هیچ
هەر هیچی تێدانەبوو
دواتر زانیم
جیهانی من گۆرستانێکی گەورەیە[٧٠]

شاعیر لە هەموو شتەکان نامۆ دەبێ، بە تەنیا تێشکی گۆڕی دایکی کە هیوای جارێکی تر پێ دەبەخشێتەوە وئارامی دەکاتەوە دوو ساڵ پاشتر

له قولایی چاوەکانتا تێشکێك هەڵبوو
گەرم وەك خۆری شارەزوور
هێمن وەکو تریفەی مانگ
لەنێو مێرگی چاوەکانتا
گوڵجاری گوڵ خەرمانەی دا[٧١]

(کەمال میراودەلی) گەشت یان هێلانەکانی سەر درەختی ڕەشەبا، گەشتێکە بەڕابردوو و ئێستای گەلەکەماندا، ڕابردووی پڕ لە تراژیدیاو مەرگەسات و ئێستای پڕ لەگومان و ترس و نەهامەتیو نادیاریو ڕەش بینی و برسێتی و بەڕەڵلایی و هیلاکی.

تـــاریکـــــایـــی دەبـــــارێ
تاریکایی هـەڵـدەقـولـــێ
تـــاریکـــایـــی وەك شـەپۆڵ
وەك شالاوی تاعوون ڕادەکشێ
ســەوڵ لێــدە، ســەوڵ لێــدە[٧٢]

له کۆتایی گەشتەکەیدا شاعیر دەگاتـه ئەنجامێکی ڕاسـت و دروسـت کـه دەربـازبوون لـەم هـەموو مەرگەسـاتانە، تـەنیا و تـەنیا بـە پشـت بەخۆبەسـتنە، بەوازهێنانـە لـە نـاکۆکی خۆماڵیانـە، بەمتمانـە بـەخۆ کردنـە، ئینجـا دەتـوانین هێلانەیـەکی بچووك، سادە، هـێمن بـۆ خۆمـان چێبکەین.

دەبێ لەسەر دووپێی خۆم بوەستم
دەبێ بەتەنیا ئەم گەشتە ئەنجام بدەم
دەبێ قۆڵم بکەمە سەوڵ
چاوم بکەمە دووربین
خوێنم بکەمە خوێ
دەبێ گۆشتی ڕانی خۆم بخۆم
هات و نەهاتی خۆم یەکالا بکەمەوە[٧٣]

ئەنوەر مەسیفی لەشیعری (پێڵاو)دا، شاعیر سێرکی بەتاڵی دەکا نامۆبوونی خۆی لەناو بەتاڵیدا پێشان دەدا و هەروەها تێکەڵاوی نامۆبوونی خۆشی دەبێ زۆر هونەرمەندانەش سێرکێکی پڕلە نامۆبوونی درووست کردووە نامۆبوونی ژن، گا، ئاسنبێژ، ئایین، قەبر کە بەنامۆبوونێکی کەونی پێناسەبکرێ کەئەمەش خۆی لەخۆیدا بەشێکە لەنامۆبوونی مانەوە،

بۆ ئەو پێڵاوەی
کەلەبەتاڵی لەناو ئاوە کافرەکانم نا
ئاسنبێژ لەبەتاڵی
باران دەخۆنەوە
لەبەتاڵی کەونیان
لەسەر قەبری بەتاڵ دا
لەبەتاڵی قەمبوورم[٧٤]

له کۆتایی‌دا شاعیر پێشبینی هاتنی (پەرەمووچ) دەکا بۆ ئەوەی فەرامۆشییەك بەوناموبوونەی بدا.

پەرەمووچ دێ
کەونەکان پڕدەکا
پەرەمووچ دێ
قەبرە بەتاڵەکان پڕدەکا
پەرەمووچ دێ
ئاوە کافرەکان پڕدەکا[٧٥]

(هاشم سەراج) لەدوا بەرهەمی (گۆڕستانی ئەپیکۆرۆس)دا لە شیعری (مەرگ و جوانی)دا شاعیر لەبەرامبەر بوون دا تووشی ناموبوون دێ، پێیوایە بوون بەخودە جوان و بەدەکانی‌دا شتێك نییە، هەرئەوەندەت زانی لەپێش چاو بزرو وون دەبێ.

کێ دەڵێ
سەحەرێك لەهێکرا
ئێوارەیەك لەناکاو
خێوەتی وجوودت تێکنانێی
بێ چیە
ماڵئاوا ئەی خودە جوانەکان
ئەی خودە
دزوون و بەدەکان[٧٦]

بـەلأم خـودە ژوون و بـەدەكان بـەرەو مـەرگ دەچـن‌و فرێدەدرێنـە دەرەوەی مێژوو، خودە جوانەكانیش بەنەمری دەمێننەوە و پەیكەریان بۆ چێ دەكرێ،

بوەستە بەرامبەر پەیكەرێ
كە هێشتا
ڕوخساری سەردەمی منالی دەلەرزێ[٧٧]

(سـەباح ڕەنجـدەر) لـەدوا بەرهـەمی (ڕووەكـانی خوداوەنـد)دا، لەقەسیدەی (مەرگ و ئاوێنە)دا ناكۆكە لەگەڵ ژیان‌و بـوون پێی‌وایـە كـە بوون و لەدایك بوون، زوڵم لەمرۆڤدەكەن ئەمەش لـەوە دێت كـە شـاعیر بەرامبەر بەم ژیانە سەخت و دژوارە هەست بە نامۆبوون دەكات، هەست دەكـات ژیـان ئـیرادەی لەدەست داوە، مـرۆڤ خـاوەنی خـودی خـۆی نییـە، وەكو ئامێرێكی بێ گیانی لێهاتووە، هـەموو خـود و بـەهاكانی دەدۆڕێنـێ بەجۆرێ وەكو لاشەیەكی مردووی لێدێ.

تەرمێك لەشوستە پاكەت دەفرۆشێ[٧٨]

(بەڕۆژ ئاگرەیی) شاعیر لەبەرهەمی (لەودیو شـەوی پەیڤەكانـەوە) هەمووی لە بابەتی نامۆیی شاعیرەوەیە، شـاعیر لەترسی تۆقانـدن، ڕووی كردۆتە مەنفا، لەتاراوگەش ئەوەندە بێزارە، ئەم بێزاریەش لەوێنەیـەكی زۆر جوان بەرجەستە دەكات و دەڵێ،

لێرە ژیان
دەفتەرێكی دڕاوی بەر ڕەشەبایە[٧٩]

لەگەڵ دۆزینـەوەی زانستی نـوێ و دواکـەوتنی درکی کۆمەڵایـەتی، زیاتر هەستی نامۆبوون ڕوو لەزیادبوون دەکات، چونکە مرۆڤـی ئاسایی لـەجیهانی پێشکەوتوودا هەسـت بـە ئـارامی گیـانی ناکـات، بەتایبـەتی جیهانێـك کـە تـەنیا زاناکـان تێیبگـەن و خـەڵکی هەسـت بـەنامۆبوون دەکەن، کاریگەری لەئەدەب و هەونەری سەدەی بیستەهەم لـە ئـەوروپادا بەئاشـکرا دیـارە لەبەرهەمـەکانی (کافکـا) لەبەرهـەمی سـوریالیەکان، لـە کۆمیدیای (صموئێل بێکت) لە شیعرەکانی (البیتینیکس)ی ئەمریکی. وە لەئـەدەبی عـەرەبیش دا، ئـەدەبی مەهجـەر بەنموونـە ئـەدەبی تاراوگـە دادەنرێت، بەڵام لەشیعرو ئەدەبیاتی کوردیـدا، هێشتا ئـەدەبی تاراوگـەی تێدا دروسـت نـەبووە، چونکە شاعیرانی کـورد لـەدەرەوە نـەیان توانیـوە وەکو شـاعیرانی عـەرەبی و ئـەوروپی بچنە نـاو جیهانـە ڕۆشـنبیرییەکە، هەنـدێکیان لـەدەرەوەی مێژووەکـەن، بەشـێکی کـەم تـۆزی کاریگـەری ئـەدەبی ئـەوروپی پێـوە دیـارە، بـەڵام هێشـتا ماوەیـەتی بگاتـە ئاسـتی پێویست و شاعیرانی کـورد لەتاراوگە زیـاتر هەسـتی و سـۆزی نـامۆیی و غوربـەت لەبەرهەمـەکانیان دەبـیترێن، شـاعیرانی کوردسـتانیش هەسـتی نـامۆبوون بەسـەریاندا زاڵـە، ئەمـەش زیـاتر بـۆ بـارەی کوردسـتان دەگەڕێتەوە.

1 – Aalto anneaux, Encuclopedia, Universalis, volume I, Paris, 1970, P.66.

2 – Meyers Universal – Lexikon, Band I, Veb Bibliographisches institut, Leipzing, 1980, P.634.

٣ – سيرغي بوبوف ترجمة نزار عيون السود، الاشتراكية و النزعة الانسانية، دار دمشق، بيروت، ص١٥.

٤ – مجاهد عبدالمنعم مجاهد، الانسان و الاغتراب، سعدالدين للطباعة و النشر و التوزيع، ط١، دمشق، ١٩٨٥، ص١٣٥.

٥ – ريتشارد شاحت، ترجمة كامل يوسف حسين، الاغتراب، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، ط١، بيروت، ١٩٨٠، ص١٠١.

٦ – كارل ماركس، ترجمة الياس مرقص، مخطوطات ١٨٤٤، الاقتصاد السياسي و الفلسفة، منشورات وزارة الثقافة دمشق، ١٩٧٠، ص٢٧٥.

٧ – نفس المصدر السابق، ص٩٤.

٨ – نفس المصدر، ص٢٠.

٩ - نفس المصدر، ص١٨١.

١٠ – نفس المصدر، ص١٨١.

١١ - نفس المصدر، ص٢١٤.

١٢ – سيمون دىبوفوار، ترجمة جورج طرابيشي، الوجودية و حكومة الشعوب، دار الاداب، بيروت، ١٩٦٢، ص٣١.

١٣ – د.زكريا ابراهيم، الفلسفة الوجودية، دار الوثبة، دمشق، ص٣٣.

١٤ – د. فوزية ميخائيل، رسورين كير كجورد ابو الوجودية، دار المعارف، ص٨٠.

١٥ – رمضان لاونـد، وجوديـة ووجوديـون، منشورات دار مكتبـة الحيـاة، بيروت، ص١٠٩.

١٦ – ريتشارد شاحت، ترجمة كامل يوسف حسين، الاغتراب، المؤسسة العربية للدراسات والنشر بيروت، ١٩٨٠، ص٢٦٣.

١٧ - نفس المصدر، ص٢٦٤.

١٨ – ر.م. البريس، ترجمة سهيل ادريس، سارتر والوجودية، دار العلم للملايين،بيروت، ١٩٥٤، ص١١٤.

١٩ – جان پول سارتر، ترجمة عبدالرحمن بدوى، الوجود والعدم، منشورات دار الاداب، بيروت، ١٩٦٦، ص٥٨٨.

٢٠ – جان پول سارتر، الوجودية مذهب انساني، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٧٨، ص٤٨.

٢١ – عدنان عبدالرحيم، فرويد والطبيعة الانسانية، دار الحقائق، بيروت

٢٢ – محمود رجب، الاغتراب، مطبعة الاطلس، الاسكندرية، ١٩٧٨.

٢٣ – صورة خافز، أية ٣٩.

٢٤ – الدكتورة سميرة سلامي، الاغتراب في الشعر العباسى، دار الينابيع، دمشق، ٢٠٠٠، ص٢٥.

٢٥ – رواد مسلم، جا، ص١٣٠.

٢٦ – د. محمد زكى العشماوى، الادب وقيم الحياة المعاصرة، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٠، ص٥٢.

٢٧ – نفس المصدر السبق، ص٥٢.

28 – Colin Wilson, The outsides, 1956, P.29.

٢٩ – روبيردى لوبيه، ترجمة د. سهيل ادريس، كامو والتمرد، بيروت، ص١٢ – ١٣.

٣٠ – جان بول سارتر، الغثيان، ترجمة د، سهيل ادريس، بيروت، ١٩٦٢، ص٢٩.

٣١ – روبيردی لوبيه، كامو والتمرد، ص٩٦.

٣٢ – ارنست فيشر، ترجمة اسعد حليم، ضرورة الفن، الهيئة المصرية العامة للتأليف والنشر، ١٩٧١، ص١١٠.

٣٣ – نفس المصدر السابق، ص١١٣.

٣٤ – الحياة اللندنيه، العدد ١٣٥٦٦، ٢٠٠٠.

٣٥ – الحياة اللندنيه، العدد 13786، 2000.

٣٦ – شێركو بێكەس، ئەزموون، سلێمانی، ٢٠٠١،ل١٥٣.

37 – Games whitlark and wendell Aycock, The literature of Emigration and Exile, united states of America, 1992, P.1.

٣٨ - شێركو بێكەس، ئەزموون، ص٣٩٩.

٣٩ - شێركو بێكەس، دەربەندی پەپوولە، ئاپێك، ستوكهولم، ١٩٩١، ل١٢٣.

40 – The literature of Emigration and Exile, P.1.

٤١ – شێركۆ بێكەس، خاج و مار و ڕۆژمێری شاعیری، چاپەمەنی خاك، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٣٤٦.

٤٢ – عدنان عبدالرحيم، فرويد و الطبيعة الانسانية، دار الحقائق، بيروت، ص١٠٢.

٤٣ – شێركۆ بێكەس، بۆننامە، لەبلاوكراوەكانی بنكەی ئەدەب و ڕووناكبیری گەلاوێژ، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٦٧ – ٦٨.

٤٤ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦.

٤٥ – پاشكۆی ڕۆژنامەی هەرێمی كوردستان، ژمارە ١، سلێمانی، ١٩٩٨، ل٢.

٤٦ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٧ – عەبدوڵلا پەشێو، بروسکە چاندن، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل١.

٤٨ – دیوانی عەبدوڵلا پەشێو، هەولێر، ٢٠٠١، ص٢٧٥.

٤٩ – ئەمین شێخ علاء الدین نقشبندی، تەصەوف چیە، دار الحریە للطباعة – بغداد، ص٣٦٥.

٥٠ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٧.

٥١ – فەرهاد شاکەلی، هەمووڕازی من ئاشکرایە و هەموو ئاشکرای تۆ ڕاز، ئاپێك، ستۆکهۆڵم، ٢٠٠١، ل٧٣.

٥٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٧.

٥٣ – ڕەفیق سابیر، ژوانی ڕوناکی، لەبڵاوکراوەکانی ڕابوون، سوێد، ١٩٩٧، ل٣٣.

٥٤ – ڕفیق سابیر، ڕوونبوونەوە، لە بڵاوکراوەکانی ڕابوون، سوێد، ١٩٩٧، ل٣٣.

٥٥ – قوبادی جەلی زادە، هەمیشە ڕوولە خودا هەمیشە مەست، چاپکراوی بەستە، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٥٠.

٥٦ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧.

٥٧ – حەمە سەعید حەسەن، نووسینی بێووشە، ئاپێك، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٩، ل١٣.

٥٨ – مەهاباد قەرەد غی، ، ازەی ڕۆح، چاپخانەو ئۆفسێتی سەفوەت، کوردستان، ١٩٩٩، ل٣٩ – ٤٠.

٥٩ – بەختیار عەلی، لە کۆمەڵەی (گوناهـ و کەرنـەڤال) بلاّوکراوەتـەوە، بۆ شیعرەکە بڕوانە، عەتا قەرەداغی، گەڕان بەدوای ناسنامەدا، سلێمانی ٢٠٠١، ل٢٣٤.

٦٠ – نـەوزاد ڕەفعـەت، هـەژانی بـەرد، چاپخانەی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری، هەولێر، ١٩٩٩، ل٤٦.

٦١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧.

٦٢ – گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٧، هەولێر، ساڵی ١٩٩٧.

٦٣ – هەمان سەرچاوەی پێشوو،

٦٤ – ڕۆستەم باجەلان، غـەریب، لـە بلاّوکراوەکانی بزاڤـی ڕۆشـنبیرانی نوێخواز، هەولێر ٢٠٠١، ل٧.

٦٥ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.

٦٦ – کەریم دەشتی، پیانۆی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٨١.

٦٧ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٨.

٦٨ – چنوور نامیق حەسەن، مەرکانە شکاوەکانی جەنگ، هـەولێر، ١٩٩٩، ل٤١.

٦٩ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢.

٧٠ – پشـکۆ نەجمـەدین، لـەتێك غوربـەت لەتەمەنـدا، کتێبـی گـولان، هەولێر، ٢٠٠٠ ل٢٩.

٧١ – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

٧٢ – گەلاوێژی نوێ ژمارە ١٩، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٠٥.

٧٣ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧٤ – گۆڤاری ڕامان ژمارە (٥) ساڵی ١٩٩٦.

٧٥ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧٦ – هاشم سەڕاج، گۆڕستانی ئەپیکۆرۆس، وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٣٣.
٧٧ – هەمان سەرچاوەی پێشوو،
٧٨ – سەباح ڕەنجدەر، ڕووەکەکانی خواوەند، لە بڵاوکراوەکانی دەنگی میللەت، هەولێر، ١٩٩٩، ل٨٦.
٧٩ – بەڕۆژ ئاکرەیی، لەودیو شەوی پەیفەکانەوە، ستۆکهۆلم، ١٩٩٦، ل٤٥.

## بزوتنەوەی وەرگێڕان چۆن پەرە دەستێنێ

وەرگێڕان هونەرە، هونەرێكی گرانیشە، پێویستی بە بەهرەو توانـاو لێهاتوویی و شارەزایییەوە هەیـە، بەتایبەتی شارەزایی لـەو زمانـەی کـە وەری دەگێڕێ، هەروەها ئەو زمانەی کەپێی وەردەگێـڕێ، وەرگێـڕ دەبـێ خـاوەن ئـەزمونێکی بـاش بـێ لەهـەردوو زمانەکـە، بـەکورتی دەبـێ نەهێنییەکانی هەردوو زمانەکە بزانـێ، چ لـە ڕووی ووشـەوە بـێ یـاخود لەرووی ماناوە بێت. واتە وەرگێڕ دەبێ زەوقی لەهەردوو زمانەکە هەبێ، ئەگینا کارەکەی سەرکەوتوو نابێت، پەندێکی ئینگلیزی هەیە دەڵێ:-

وەرگێڕان کارێکە سوپاس و ستایشی ناوێ، مانای پێویستی بەهەوڵو کۆششـێك هەیـە زیـاترە لـەو هـەوڵو کۆششـەی دانـەر، وەرگێـڕ دەبـێ رۆشنبیریەکی بەرفراوانی هەبێت ئەمە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە دەبێ وردبـین و پسپۆربێت لـەو بابەتـەی کـە وەری دەگێـڕێ، چـونکە ئـەرکی وەرگێـڕ هـەر ئـەوە نییـە کـە ووشـەو دەربـڕین لـە زمـانێکی بیانییـەوە وەرگێڕێتە سەر زمانێکی تر بـەڵکو گرنگی لەوەدایـە کـە وەرگێـڕ گیـانی نووسـەرەکەو کەسـایەتی دانەرەکـە تـێ بگـات، ئێمـە زۆر پێویسـتمان بـە وەرگێـڕان هەیـە وەك لـەدانان، بەتایبـەتی وەرگێڕانـی شـاکاری جیهـانی لەزمانە زیندووەکانەوە، وەرگێـڕ سنوردارە، واتـە نـابێ لـەو شـتانە دوور بکەوێتـەوە کـە لەدەقەکـەدا بوونیـان هەیـە، بـەڵکو دەبـێ لـەو ڕادەیـە بجوڵێتەوە کەدەقەکە بەخۆوەی گرتووە.

وەرگێڕان گواستنەوەی وێنەیەکی ڕاست گۆیی دەقە سـەرەکیەکەیە، بەتایبەتی ئەگەر کارەکە زانستی بێ.

پێویسـتـە وردی تێگەیشـتن پـەیڕەو بکـرێ، ئاسـانی شـێوەکەی، بەکارهێنانی زاراوەو چەمك و واتای گونجاو کەلەگەڵ ئەو زمانە بگـونجێ

کە وەری دەگێڕێ بەڵام وەرگێڕی ئەدەبی زەحمەتترە، بۆیە دەبێ وەرگێر نووسەر بێت لەگەڵ گیانی بەرهەمەکەو خەیاڵ و کەسایەتی دانەرەکە بژێ، بەتایبەتی ئەگەر وەرگێرانەکە شاکارێکی جیهانی بێ.

**ئەو تەگەرانەی دێنە ڕێگای وەرگێڕان زۆرن لەمانە:**

١. بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری، یونسکۆ دەڵێ:- پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ، سیاسی، ئابووری و ڕۆشنبیری نابێت تاکو بەسەر نەخوێندەواری زاڵ نەبین.
٢. ئەزمەی چاپەمەنی لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا، هەروەکو ئاشکرایە کتێب خۆراکی مێشکە، فەیلەسوفی ئینگلیزی (تۆماس کارلیل) دەڵێ:- زانکۆی ڕاستی لە رۆژی ئەمڕۆماندا بریتییە لە کۆمەڵە کتێبێك.
٣. نەبوونی ئامۆژگای تایبەتی وەرگێڕان.
٤. بەهۆی جوداوازی سروشتی زمانەکان، لەووشەو دەربڕین و بۆچووندا، بۆیە لەکاتی وەرگێڕاندا لەزمانی دووەم و سێیەمەوە زۆر شت دەگۆڕێ و دوور دەکەوێتەوە لەدەقەکە، بۆ نموونە جبران خەلیل، شەکسپیری لەزمانی فەرەنسییەوە وەرگێرا، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی گەلێ ووشەی قورس بەکار بهێنێ، ئەگەر بهاتبایە لە زمانی ئینگلیزی وەری گێڕا با، بێ شك باشتر و بە پێزتر دەبوو.

ڕۆشنبیری هەر وولاتێك بە ڕۆشنبیری بیانییەوە پێش دەکەوێ و روو لەزیاد بوون و نەش و نماکردن دەکات، ئەمەش بێگومان لەرێگای ناردنە دەرەوەی کادرو فێربوونی زمانی ئەوروپییەوە دەبێت، تاکو بتوانین پەنجەرەیەك لەسەر ڕۆشنبیری وڵاتەکەیان والا بکەنەوەو نەهێنی شارستانیەتی نەتەوە پێشکەوتووەکان هەڵ بمژن و

لەووڵاتەکەیاندا موتربەی بکەن، بوارە جیاجیاکانی ئەدەبی و زانستی پێ نوێ بکەنەوە، یاخود لەڕێگای بازرگانی و ئاڵوگۆڕەوە دەبێت، یان بەهۆی داگیرکردنەوە، بۆ نموونە داگیرکردنی سەرووی ئەفەریقا لەلایەن فەڕەنسیەکانەوە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی کولتوورو زمانی فەڕەنسی کە تارادەیەکی باش سوود بەخش بوو، بووە هۆی ئەوەی کەڵە شاعیرو نووسەر لە سەرووی ئەفریقا سەر هەڵبدەن، وەکو (کاتب یاسین)، (عبدللطیف اللعبی) و چەندانی تر، لەلوبنانیشدا (صلاح ستیتیە)، (جۆرج شحادە)و (پول شاول) پەیدا ببن.

لە رووی زانستیشەوە ئەمڕۆ لەجیهاندا لە ئاستی بەرز هاوکاری لەنێوان ئەوروپادا دەکرێ، بۆیە دەڵێن زانست نیشتمانی نییە، بەلاّم رۆشنبیری خاوەنی زێدە.

یارمەتی لەنێوان نوسەراندا کاریگەرێکی باشی هەیە، بەپێچەوانەوە دوورە پەرێزی و کاری تاکە کەسی رەگەزێکی ترسناکەو کاری لەسەر بەرهەمی ئەدەبی جێ دەهێڵێ.

گۆتەی شاعیر وهزر دژی ئەو بیروباوەڕە بوو کە دەیووت رۆژهەلاّت ، رۆژهەلاّتە، رۆژئاواش رۆژئاوایەو چۆن دەگەنەوە یەك، کەسێك بوو کە رۆژهەلاّت و رۆژئاوای کۆکردبۆوە.

* * *

## گرنگی وەرگێڕان و گیروگرفتەکانی

وەرگێڕان مانای چییە؟ ئایا وەرگێڕانی شیعرخیانەتە؟ وەرگێڕان سوودی بۆ شیعر و ئەزموونی شاعیر گەلێك زۆرە، بیرو ئاسۆی فراوان دەبێت، زمانەکەی بەتێڕوانین و بیری نوێ موتربە دەکات، فەرهەنگی شاعیر بە ووشەو دەستەواژەی نوێ زەنگین دەکات، هەروەها سوودێکی زۆری بۆ ئەو کەسانە هەیە کەزمانی بیانی نازانن، شاعیری سۆڤیەتی (یفتوشنکو) دەڵێت:- وەرگێڕانی شیعر وەکو ئافرەتە ئەگەر وەرگێڕانەکە ئەمین نەبێت، جوان دەبێت ئەگەر جوانیش نەبێت ئەوا وەگێڕانێکی ئەمین دەبێت، ڕووداوی وەرگێڕانی شیعر ڕووداوێکی مەزنە لەبواری ڕۆشنبیریدا کاتێ وەرگێڕ بتوانێ بچێتە ناخی زمان و خەیاڵی شیعرێکی ترەوە، خەڵکی ناتوانن لەزەت لە شیعرێکی وەرگێڕدراو وەربگرن، ئەگەر وەرگێڕانەکە توانایێکی ئەوتۆی نەبێ کە شیعرەکە بە زمانێکی تر دابهێنێت، چونکە شیعرکاری داهێنانە پێش ئەوەی کاری گواستنەوە بێ کەسێ ناتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات، ئەگەر هەست و سۆزێکی ناسکی نەبێت، وەرگێڕان ئاسان نىیە جاران عەرەب دەیوت، شیعر وەرناگێڕدرێت، (ڤیکتۆر هۆگۆ) دەڵێت: وەرگێڕان خیانەتە، (بۆریس باسترناك)(١٨٩٠-١٩٦٠)دەڵێت: هەموو شتێ لەسەر جۆری وەرگێڕانەکە دەوەستێت، تەنانەت باشترین وەرگێڕانیش ناتوانێ جەوهەر و سیحری دەقە بنچینەییێکە بەباشی دەربخات، بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر ئەم بابەتە بیروڕای هەندێ لە شاعیرانی عارەب دەخەینە ڕوو کە شیعریان وەرگێڕاوە، لەوانە سەعدی یوسفی شاعیر کەدەڵێت: هەندێ جار وەرگێڕانی قەسیدەیەك ڕۆژێکی تەواوی دەوێ، شاعیری فەرەنسی(پییر لیرین)دەڵێت: ئەوەی حەزی لێدەکەم لە وەرگێڕانی شیعردا، ئەوەیە

کەهەموو گیروگرفتەکان شوێنێکی کەم داگیردەکەن، تا ڕادەیێکی زۆر لە مۆسیقا دەچێت، لەپێشەوە تەسویرێکی زەینی دانەری مۆسیقی دێت، پاشان ڕۆڵی جێبەجێ کردنی دێت، بەهرەی هونەری لەدەست خستنی مۆسیقا بەشێوەیەکی تاکی لەقووڵایی شیکردنەوەی بینای تەواوی کارەکەوەدێت، بەبێ وەرگێڕان ناتوانرێت پارێزگاری لە کەلەپورو ڕۆشنبیری جیهانی بکرێت، بەهۆی شەڕو شۆڕو، سروشتی تێکدەرەوە، تووشی لەناوچوون دەبێت، وەرگێڕان دیالۆگێکی بابەتییە لەنێوان هێزەکانی مرۆڤ کە ڕۆشنبیری هەمە چەشنەیان هەیە، ئەگینا وەرگێڕان دەبێتەهۆیەك بۆ چەوساندنەوەی ڕۆشنبیری لەلای هێزی باڵا.

وەرگێڕان تەنیا گواستنەوەی زمانێك نییە بۆ زمانێکی تر، بەڵکو وزەیێکی زیندووە لەتوانایدا هەیە کۆمەڵ بەخێرایی بگۆڕێت. هەروەها گواستنەوەی دەقێکە لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیێکی تر لە دنیاییێکەوە بۆ دنیاییێکی تر لەتێڕوانینێکەوە بۆ تێروانینێکی تر. وەرگێڕان ئیمرۆ زانستێکی نوێیە لە زانستەکانی مرۆڤایەتی، وەرگێڕ پێویستە کە گرنگی یاساو دەستووره نوێکانی بزانێت، کە بۆتە زانستێکی ورد، وەرگێڕ پێویستە هەر دوو زمانەکە بەباشی بزانێ، هەروەها ئاگاداری ئەو بابەتە بێ کەوەری دەگێڕێت لەسەر ئەمەش پێویستە وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە (وەرگێڕان مانای چییە، چۆن پێویستە وەربگێڕین؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە، پێویستە وەرگێڕ، وەرگێڕێکی ڕاستەقینە بێت، زانیاری وەرگێڕان، مانای زمان، مەرجەکانی وەرگێڕان، ڕێگاکانی وەرگێڕان، زانستی زاراوەکان و زانستی ڕەوانبێژی بزانێ، وەرگێڕان هونەرێکی مرۆڤایەتی پێشکەوتووە، هونەری داهێنان و بەهرەیە، کاری وەرگێڕ ئەوەیە کەبیر دادەڕێژێت و ووشەکان بەرەو ڕووی خوێنەر

دەكات، جیاوازی لەگەڵ ئەدیبدا ئەوەیە کە بیرەکانی بیری خۆی نییە، دیارە گواستنەوەی بیریش گرانترە لەوەی بینوسێ، کاتێ نووسەر بیرێکی تایبەتی خۆی دەربڕێت سەربەستێکی زۆری لەبەکارهێنانی زماندا هەیە، زیاتر هونەرێکی پراکتیکیە کە لە ئەنجامی مەشق کردن و بەهرەوە چێ دەبێت، چونکە لایەنی جوانکاری و لایەنی داهێنانی تێدایە، ئەمەش مانای ئەوە نییە کەکەسێ زمانی ئینگلیزی یاخودفەرەنسی زانی، دەتوانێت دەقێکی وەرگێڕدراوی باش پێشکەش بکات.

وەرگێڕان دەزوویەکە لە کلافەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی، ئەگەر وەرگێڕان نەبوایە، گەلان لێکتر جوداو پەیوەندیان لەنێوانیاندا نەدەبوو لە ڕوانگەی ئەو تیورەی کە دەڵێت شارستانیەت قۆناغە، لەهەر قۆناغێکدا گەلێك لەگەلەکان هەڵگری تیشکی شارستانیەتەو هیچ گەلێك ناتوانێت تا سەر ئەم مەشخەڵە هەلگرێت، بەڵکو گەلێکی تر لێی وەردەگرێت و دەیداتە گەلانی دوای خۆی سوود لەتاقیکردنەکە وەردەگیرێت کە پێشتر بینویەتی پەرەی پێ دەدات و لەناو گەلە پێشکەوتووەکانی ئەوروپادا پیشەیەکی هونەرییە پسپۆری تایبەتی و ڕێکخراوی سەندیکای تایبەتی ناوچەیی و جیهانی هەیە، کەچی لەجیهانی سێیەمدا و لەناو گەلە دواکەوتوەکاندا، بەتەنیا هەوڵ و کۆششی تاکە، کاربەدەستەکان فەرامۆشی دەکەن،ئەمەش وای کردووە کە بەرهەمی وەرگێردراو بە پەنجەی دەست بژمێردرێت.

## گرنگی وەرگێڕان

١. هەوێنی داهێنان و لێکۆڵینەوەیە، کە یارمەتی زانست و زانیاری مرۆڤ دەدات، سوود لەوئەنجامانە وەردەگرێ کە مرۆڤایەتی گەیشتویەتێ نەك لە سفرەوە دەست پێ بکات.

٢. وەرگێڕان پردێکە لەنێوان گەلان و شارستانیەتی گەلان، مرۆڤ هەردەم لەهەوڵ و کۆشش دایە بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری گەلانی تر، لەبەر ئەوە شارستانیەت لە جیهاندا بنکەی شوعلەو تیشکە کەلە هەموو لایەکەوە بۆی دەچن، ئەو گەلەی رۆشنبیری کەمترە، لاسایی گەلانی رۆشنبیری بالآ دەکاتەوە. بە وەرگرتنی راستەوخۆی زانست و گواستنەوەی لە رێگای وەرگێرانەوە.

٣. هۆیێکی بنچینەییە بۆ پێناسە کردنی زانست و تەکنەلۆژیا، ئەوەی زاناکان دەیدۆزنەوەو تەکنۆلۆژییەکان دەیگەنێ بەهۆی وەرگێڕانەوە دەگاتە شوێنەکانی تر لە جیهاندا، زانای فەزاو، نەوەوی، کیمیاو پزیشك و ئەندازیاری ئەلیکترۆنی هەموو ئەنجامەکان لەبوارە جیاجیاکاندا دەنووسرێنەوە و پاشان بۆ زمانەکانی تر دەگوێزرێنەوە.

٤. رەگەزێکی سەرەکی پرۆسەی پەروەردەو فێرکردنە، چونکە پرۆگرامی پەروەردە و کتێبی قوتابخانە لەهیچەوە پەیدا نابێت، بەلکو بەشێوەیەکی گشتی پشت بەوەرگێڕان دەبەستێت.

٥. ئامرازێکە کە بەهۆیەوە دەتوانین لەگەڵ بزوتنەوەی فیکری و رۆشنبیری جیهانی بڕۆین، لەگەڵ پێشکەوتن و پەرەسەندنی هۆیەکانی ڕاگەیاندن، وەکو ئیستگەو تەلەفزیۆن کە ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆ دەبینێت لە گواستنەوەی دەنگو باسی ڕۆشنبیریو

دەستکەوتەکانی ڕۆشنبیریو فیکریدا، لەگەڵ ئەوەشدا وەرگێڕان ڕۆڵی پێشڕەوایەتی خۆی دەبینێت بەڵام کتێب بڕبڕەی پشتە بۆ وەدەست خستنی ڕۆشنبیری.

٦. هۆیێکە بۆ دەوڵەمەند کردنی زمان و پەرەپێدانیو هاوچەرخایەتی کردنی، چونکە وەرگێڕان پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت، کەبەدوای ووشەو زاراوەی نوێ و بۆچوونی نوێ بگەڕێ، لەبەر ئەوەی زمان بوونەوەرێکی زیندووە، لەدایك دەبێت و دەمرێت، بوونی بەندە بە وەرگرتن و دانەوە، بە مردن و نوێکردنەوە، چەندان زمان لەسەرەتادا مەزن بوون، پاشان لەناو چوون، هەروەها چەندان زمان هیچ بایەخێکیان نەبووە، کەچی دوایی بوونەتە زمانی جیهانی. زمان خاسیەتی بوونەوەری زیندووی هەیە، گەورەو بچووك دەبێت، بەدەردەکەوێت و لەناو دەچێت، ئەو زمانەی کەنەیتوانی پێشکەوێت و نوێ بێتەوە پێویستە بمرێت لە پرۆسەی پەرەسەندن و نوێ بوونەوەدا وەرگێران ڕۆڵێکی بنچینەیی دەبینێت.

## ئەرکی وەرگێڕان

ئەرکی سەرەکی وەرگێڕان گواستنەوەی داهێنانی گەلانی ترە بۆ سەر زمانەکەمان و سوود وەرگرتن لە ئەزموونەکانیان بۆ ئەوەی شتەکانی لای خۆمانی پێ نوێ بکەینەوە، بۆیە پێویستە ئەو دەقانە وەرگێرین کە بە گوێرەی خۆمانەوە تازەن و دەبنە هۆی تازەکردنەوەی دەقەکانی لای خۆمان دەبێت بزانین چ وەردەگێڕین، بۆ نموونە عارەبەکان لەساڵی ١٩٨٩دا گیرگرفتی لاوەکانی ئەمریکای ساڵی ١٩٦١ یان وەرگێڕا سەر زمانی عارەبی. جالێرەدا پرسیارێ سەر هەڵدەدا، ئایا ئەم

جۆره كتابانـه وەرگێرانـی بـۆ سـەر زمـانی عـارەبی سـوودی دەبێـت؟ وەڵامەكـەی بەڵێیـە، چـونكه ئـەو گیروگرفتــەی ئەمریكیــەكان كەلـه شەستەكاندا هـەیان بـوو، عارەبـەكان لەنەتەوەكانـدا هـەمان ئاسـتەنگیان هاتۆتە رێ... جا وەرگێران سوود بـەخش دەبێـت، بـۆ نموونـه باسـی بـێ ئیشی، دابەزینی رەوشت، دابەزینی پلـەی زانسـتی، كـەم بـوونی توانـا، بـێ بڕوایـی بـەدوا رۆژ، لـەلای ئێمـەی كـوردیش هـەمان شـت ئیمـڕۆ سـەری هەڵداوه.

## زمانی كوردیو وەرگێران

زمانی كوردی بەربەستی هێرشی سەربازی داگیركەرانی كوردستانی كردووه، هەروەها توانیویەتی خۆی ڕاگرێ و پارێزگاری زمانەكـەی بكات بەرامبـەر زمانـانی داگیركـەرانی كوردسـتان، هـەر چـەنده لەسـەدەكانی پێشـوودا كاریگـەرییان بەسـەر زمانەكەمانـەوه دیـاره، بـەڵام لەسـەدەی بیستەهەمدا هەڵمەتی پاك كردنەوەی زمانی كوردی له زمانی عـارەبی و فارسی و توركی كەوته نـاوەو بەهـەموو لایێـك توانیـان زمـانێكی كـوردی پەتی بێننه ئاراوه، هەندێك ووشەی عارەبی هاتۆته ناو زمانەكەوه بەڵام كـورد توانیویـەتی گـۆڕانی بەسـەردا بكاتو جلێكـی كـوردی لەبـەربكاتو ببێته ووشـەیێكی خۆمـاڵی وەكو ووشـەی (فقط)بـوو بـه فـەتق، ووشـەی (عقوبه) بوو بەناوقوبه، گەلێ ووشەی تر.

(برنـامج) بـوو بـه بەرنامـه، هەنـدێك ووشـەی ئـەوروپایی هەیـه، پێویست ناكات لەكاتی وەرگێڕاندا وەریان گێڕین، چونكه لەهەموو زمانه ئەوروپاییەكانــدا بــەكار دێــت، بــۆ نموونــه (Television)، (assimilation) بەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی یەكه هەروەها ڤیدیۆ،

کامیرا، ستریۆ، میکرۆفۆن، ڕادیۆ، برۆتۆن، نیوترۆن، ئەلکترۆن ووشەی جیهانین هیچ سوودێکی نییە بکرێنە کوردی و بەکارهێنانیان وەکو خۆی بەخەوشی زمان دانانرێت، چونکە لەهەموو زمانە ئەوروپاییەکاندا بەکار دەبرێت، جگە لەمەش زمانی کوردی زمانێکی هیندۆ ئەوروپییە ئەگەر بەکاریان بهێنین چاکترە چونکە لەگەڵ خاسیەتی زمانەکەمان دەگونجێت: بۆ نموونە ڤیدیۆ بنچینەکەی لە ووشەی (Vide)ی لاتینی هاتووە، زمانی زیندووش ئەو زمانەیە کەبتوانێ ئەم ووشە نوێیانە بگرێتە باوەشی و لەژیانی ڕۆژانەیدا بەکاریان بهێنێ، دیارە بوونی هەندێك ووشەی بێگانە لە زمانەکەماندا نەنگی نییە چونکە زمان هۆیە نەك ئامانج هۆی گەیاندن و تێگەیاندنە، هەر چەندە هەندێك کەس دەڵێن دەبێت هەموو ووشەیێك وەربگێرین، دیارە جێبەجێ کردنی ئاواتی هەموومانە، بەلاّم قسەکە زۆر بەگران دەوەستێ و ئیشەکەمان گرانتر دەکات، چونکە زمان یاسای تایبەتی خۆی هەیە، پێویستە مرۆڤ لەبەکارهێنانیدا پەیرەوی بکات و لەبەرچاوی بگرێت.

بە کوردی کردنی زانست و زانیاری و وەرگێرانی بۆ سەر زمانەکەمان کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو دەبێت حکومەتێکی بەتوانا ئەم کارە بگرێتە ئەستۆی خۆی، کاتێ دەوڵەتی فەرەنسا زانستیان گواستەوە بۆ سەر زمانەکەیان، دەوڵەتێکی بەهێزییان هەبوو ئارامی سیاسی، ئابووری پێشکەوتوو، یەکێتی کۆمەلاّیەتی مەرجی بناغەین بۆ سەرکەوتنی ئەم کارە.

ڕەخنەگری ئینگلیزی بەناوبانگ ت.س ئەلیوت دەڵێت: هێزی دەوڵەت کامڵ بوونی ئاکی مادیاتە. یابانییەکان ئامرازێکی تەلەفۆنیان دۆزیەوە، کەدەتوانێت یابانی وەربگێرێتە سەر زمانی ئینگلیزی،

فەرەنسی و ئـەڵمانی، ئـەم ئـامرازە تـەکلیفی لەسـەر دەوڵـەت نزیکـەی (١٢٨)ملیۆن دۆلاری ئەمریکییە، کـە پێـنج ساڵ پێـوەی خـەریك بـوون، هاتنـە نـاوەوەی هەنـدێك زاراوەی نـوێ وەکـو پەرلـەمان، سـیناریۆ، ریپۆرتـاج، لـە ئەدەبـدا کلاسـیك، رۆمانتیـك، دادایـزم...هتـد، لـەبواری فەلسـەفەو سیاسـەتدا وەکو ڕادیکالی، دیماگۆگی، دیموکراسی، دیکتـاتۆر، ئایدیۆلۆجی...هتد.

ئەم پرۆسەیەش لەژێر ئالآی بە کوردی کردنی زاراوە جیهانییـەکان و نوێ کردنەوەی زمان ئەنجام درا.

## گیرو گرفتی وەرگێڕان

١. نـەبوونی پەیوەنـدی لـەنێوان وەرگێڕەکانـدا، زۆرجـار بەرهـەمێك وەردەگێڕدرێـت، وەرگێـڕ ئاگـای لێ نیـیـە، کەکەسـێکی تـریش وەری گێڕاوە.
٢. نـەبوونی هۆیـەکانی گەیانـدن لـەنێوان وەرگێڕەکانـدا بەتایبـەتی لەنێوان وەرگێڕەکانی ناوەوەو دەرەوەی وولآتدا.
٣. نەبوونی دەزگاییێکی تایبەت بەوەرگێڕان لەکوردستاندا.
٤. نـەبوونی بەرنامـەییێکی رێکـوپێکی وەرگێـڕان، بـەڵکو وەرگێـڕ بـە سەلیقەو ئارەزووی خۆی بەرهەمەکان وەردەگێڕێت.
٥. نەبوونی بیلۆگرافیاییێکی تایبەت بەکارە وەرگێڕدراوەکان.
٦. نـەبوونی بەشـی وەرگێـڕان لـە ئامۆژگـا و زانکۆکـانی کوردسـتاندا پێویسـتە بەشـی وەرگێـڕان لـە کوردسـتاندا، بکرێتـەوەو کـادری لێهـاتوویی بـۆ تـەرخان بکرێـت بـۆ وەرگێڕانـی کتـێبی ئـابووری، مێژوویی، یاسایی، فەلسەفی و دەروونناسی ...هتد.ئیمرۆکە کـەلێنێکی

گەورە لەم بوارەدا دروست بووە، بەتایبەتی بەشێك لە قوتابییەكان تەنیا زمانی كوردی دەزانن، بۆیە وتنەوەی بابەتەكانیان پێویستە بەزمانی كوردی بێت، بەزمانی عارەبی گیروگرفتی گەورەیان بۆ چێ دەكات.

٧. ئەزمەی چاپەمەنی و گرانی بەهاكانی كتێب.
٨. كەمی وەرگێڕ كە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن.

بەچارەسەر كردنی ئەم خالآنەی باسمان كرد دەروازەیێكی ڕاستەقینەی پێشكەوتن و گەیشتن بەنەتەوەكانی تر لەسەرمان والآ دەبێت.

وەرگێـڕان بەرەنگاربوونەوەیـەکی پـڕ لـە هەلاکـەت و زەحمەتـە، چونکە وەرگێڕان هەر ئەوە نیـیە کەهەردوو زمانەکە بزانی، بەڵکو دەبێ شـارەزاییەکی باشـت لـەجیهانی ڕۆشـنبیرییەکەش هـەبێ، ئـەگینا وەرگێڕانێکی بەپێزو سەرکەوتووی لێ دەرناچێ، ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە بڕوانینە ئەم دوو وەرگێڕانە، دەبینین وەرگێڕانەکەی مامۆستا حوسامی وەرگێڕانێکـی سـەرپێی و بەپەلـەو خێرایـە، پـڕ لـە کەموکوڕییـە، چ لـەرووی زمانـەوە بـێ یـاخود لـەڕووی دەسـتەواژەو دەربـڕین و دەنگـی پاڵەوانەکانەوە بێ هەڕەمەکی و بازرگانی و بـێ سـەلیقەیی پێـوە دیـارە، جگە لە قرتاندن و فەرامۆش کردنی ووشەو ڕستەی زۆر کە بۆتـە هـۆی ئـەوەی لـە زۆر شـوێندا ماناکـەی ڕوون و ئاشـکرا نـەبێت، ئەمـە لەلایەك،لەلایەکی ترەوە مامۆستا ئاگاداری ئەوە نەبووە کەلە وەرگێڕانـدا دەبێ زمـانی ئـەدەبی پـەیرەو بکرێـت، ووشـەی و زاراوەی سـەر زارەکـی بەکارنـەیـەت، بۆیـە کۆمـەڵێ ووشـەی سـەر زارەکیـی تـێ ئـاخنیوە وەك: لەکن، چتە، وێستاوە، هەرمەنی، هەر تك...تاد، هەروەها کۆمەڵێ ووشەی بـەکارهێناوە کەلەگـەڵ دابـوو نـەریتی کـوردەواری یـەك ناگرێتـەوە، بۆنموونـە هەنـدێ چـەمك هەیـە، تایبەتـە بـەکوڕ یـاخود بـەکچ کەدەردەبڕێت نـابێ تێکەلاو بکرێن. هـەروەها دەبـێ جوداوازی بکرێـت لەنێوان هاواری مرۆڤ و ئاژەڵدا، بـۆ نموونـە کـۆتر گمـەگمێ دەکات نـەك بلغـە بڵـغ وەك حوسامی نووسیویەتی، بـەلام وەرگێڕانەکـەی مامۆسـتا عـەزیز گـەردی وەرگێڕانێکـی دەقـاو دەقـی نوسـخە فارسـییەکەیەو بەشـێوەیەکی ئەوەنـدە جـوان وەریگێـڕاوە کەدەیخوێنیتـەوە واهەسـت دەکـەیت خـودی مامۆسـتا نووسـیویەتی، دەتـوانین بڵـێن وەرگێڕانێکـی

سـەركەوتوو و داهێنەرانەيـە، وردبـينی و ئەمانـەتی ئـەدەبی تێـدا بـەكارهاتووە، بەجۆرێکـە کـە گيـانی بەبـەردا کـردووە، ئەمـەش بـەلای منـەوە بـۆ سـێ خـاڵ دەگەڕێتـەوە، يەکـەم خـاوەنی رۆشـنبيرييەکی بەرفراوانـە، بەتايبـەتی لـەبواری زمانـدا، زمـانی عـارەبی و فارسـی و ئينگليـزی و فەرەنسـی جگـە لـەزمانی زگمـاك زۆربـاش دەزانـێ، دووەم خاوەنی ئەزموونێکی فرە دەوڵەمەندە لەبواری وەرگێڕاندا، خاڵی سێيەم زۆر بە سەليقە و ووردبينە، بۆيـە وەرگێڕانـەکانی بـێ وێنـەن لەئـەدەبی کورديدا.

سەگ هاتە دەرو گەروی گورگی گرت (حوسامی، ل١٠)

سـەگ دەرپـەڕی و پـەلاماری داو کەڵبـەی لەبينـە قاقـای گيرکرد(عەزيز گەردی،ل٨)

کەڵبەی لە بينە قاقای گيرکـرد، دەسـتەواژەيەکی کورديی پەتیيـە، چونکە گەروو بۆ مرۆڤ بەکاردێت.

گورگ بە بلغە بڵغ (حوسامی ،ل١٠)

گورگ بە لرخە لرخ (گەردی، ل٩)

(بلغە بڵغ) بۆ کوڵينی ئاو بـەکاردێت.(١) لرخەلرخەکـەی مامۆسـتا عەزيز راستترە.

مـامر لـەدەوری عـەمبەری کۆبوونـەوەو کەڵەشـێريش بەدەوريانـدا دەگەڕێ(حوسامی،ل١١)

مريشـك لای عـەنباری گـەنم کۆبوونەتـەوە و چـينە دەکـەن، کەڵەشـێريش لـەناويان دێودەچـێ (گـەردی،ل١٠)لـە دەقـە فارسـييەکەی

(خشك كنى) كەمامۆستا عزيز بە (چينە دەكەن) وەريگێڕاوە، كەچى حوسامى فەرامۆشى كردووە هەروەها كۆبوونەتەوە لەرووى زمانەوە راستترە.

براگيان بۆ دەترسى؟ دەزانى زوڵم نەماوەو داد دنياى داگرتوەو منيش وا دەچمە حەجێ(حوسامى،ل١١).

براگيان ترسى پێ ناوێ؟ دونيا بۆتە شامى شەريف و زۆردارى نەماوەو منيش تۆبەم كردووەو وا دەچمە حەج (گەردى، ل١٠).

مامۆستا عەزيز (تۆبەم كردووە)ى بەكارهێناوە مامۆستا حوساميش هيچ شتێكى نەنووسيوە، لەدەقە فارسييەكە (عازم) كەبەماناى بڕيار دێت واتە منيش بڕيارم داوەو دەچمەحەج.

كاكى كەڵەشێر چباسە، تۆو ڕێوى؟(حوسامى، ل١١).

پەككو! كەڵەشێر ئەوە چيم بەچاوى خۆم دى؟(گەردى،ل١٠).

دەقە فارسييەكەى (چەمى بينم)واتە چ دەبينم كەلەگەڵ دەستەواژەكەى گەردى يەك دەگرنەوە، بەڵام بەهيچ شێوەيەك ماناى (چباسە) ناگەيەنێ.

كۆتريش دەستى كرد بە بڵغە بلێغ(حوسامى،ل١١).

بەيان ئەنگوت و وەختى گمەگمى كۆتر داهات(گەردى، ل١١).

كۆتر (بلغە بلێغ)ناكات، بەڵكو وەكو مامۆستا عزيز (گمە گمێ)دەكات.

كەڵەشێر خۆى پێ رانەگيراو ديسان قوقليقوى دەست پێكرد(حوسامى،ل١١).

كەڵەشێر دەروەست خۆى نەهات، دەستى بە (قوقوقوقو)كرد، (گەردى، ل١١).

لەدەقە فارسییەکەی (قوقولی قو) نووسراوە، (حوسامی) هەر وشە فارسییەکەی بەکاربردووە، ئەگینا لە کوردیدا (قوقڤوقوو)بەکار دەبرێ.

ڕێوی گرتی و خواردی، تاو هەڵات (حوسامی،ل١١).

ڕێویش قرقرتۆکی گرت و خنکاندی و خواردیو لووزی لستەوەو ڕاکشایەوەو نووست(گەردی،ل١١).

(گەردی)وەکو دەقە فارسییەکە وەریگێڕاوە، بەڵام (حوسامی) زۆری قرتاندووە و کورتی کردۆتەوە.

کۆتری بەدەمییەوە گرت و هاتەدەرێ(حوسامی،ل١٢).

کۆتر خۆی پێ بەرزەفت نەبوو، دەستی بە گمەگم کرد، ڕێوی چەپۆکی لەکۆتر گیرکردو لە کونەکەی بردیەوە دەرەوە(گەردی،ل١١).

حوسامی زیاتر لە دە ووشەی پچڕاندووە، جوانییەکەی شێواندووە، بەڵام وەرگێڕانەکەی گەردی پابەندی دەقەکەیە.

ژنێك هەبوو بەناوی (فدان) هەموو جارێ کەتووشی وەزیر دەبوو گاڵتەی لەگەڵ دەکردو دەیوست بیخەڵەتێنێ (حوسامی، ل١٤).

ژنێکی جوان و جحێل لەو شارەدا هەبوو، ناوی فدان بوو، هەر جارەی تووشی وەزیر دەهات بەنازو فیزو بەعیشوەو غەمزەخۆی دەنواندو دەیەویست دڵی بۆ خۆی ڕابکێشێ. (گەردی،ل١٥).

(حوسامی)زۆر کورتی کردۆتەوە بەکەیفی خۆی ووشەی (گاڵتەی لەگەڵ دەکرد)ی بەکارهێناوە کەلەدەقە فارسییەکە بوونی نییە، وەرگێڕانەکەی (گەردی) لەگەڵ دەقە فارسییەکە دەگونجێ و لەفارسییەکەش زیاتر جوانکاریی تێدا کراوە.

لەسەر دارکەوتبووی هەرتك دەستت شکابوون (حوسامی، ل١٥).

لەسەر درەختێك بەربوویتەوە هەردوو دەستی شکا(گەردی،ل١٦).

(حوسامی)ووشەی سەرزارەکی زۆر بەکار دەهێنێ بۆ نموونە (هەرتك)، (هەردوو) راستترە، یاخود دەڵێ (چوە کن مێردەگەی)ل١٥، (چووە لای مێردەکەی)زمانی نووسینە، هەروەها درەختێك لە ووشەی (دار) جوانترەو لە فارسییەکەش (درخت) بەکارهاتووە.

چوونە هەر شوێنێ بەدەستی خاڵی مەگەڕێنەوە ماڵێ، هەرچی لەرێگا دیتتان لە تەپاڵەوە بگرە تا کۆنەکەوش و ئاسنەوێڵە و پەڕۆشرەو لەدەرگا کۆی کەنەوە، رۆژێك بەکار دێت،(حوسامی،ل١٩).

چوونە هەر شوێنێ قەت بەدەستی بەتاڵی مەگەڕێنەوە ماڵێ، هەرچی لەرێگا کەوتە بەرچاوتان، لەتەپاڵەی رەشە ولاغەو بگرە تا کۆنە ناڵ و پارچە ئاسن هەڵیگرنەوەو بیهێننەوە لەبەر دەرگای ماڵێ لەسەر یەك کەڵەکەی بکەن رۆژێ دێ بەکەڵك بێ (گەردی،ل٢٢).

(حوسامی) کۆنەکەوش وئاسنە وێڵەو پەڕۆشرەی بەکارهێناوە لەدەقە فارسییەکە (نعل کهنە و یا تکە ای اهن) بەکارهاتووە کەمانای ناڵی کۆن و پارچە ئاسن دەگەیەنێ، پەڕۆشرە لە فارسییەکەدا بوونی نییە، (حوسامی)بۆی زیاد کردووە، وەرگێڕانەکەی (گەردی) وەرگێڕانێکی تەواوی دەقەکەیە.

لەپەنا چۆمێك راوەستا بحەسێتەوە لەسەر ئاوێ ویستی دەست و چاوی بشوات داهاتەوە کلاوەکەی لەسەری کەوتە خوار و ئاو بردی بەسەری پەتی و دەستی خاڵی مایەوە(حوسامی، ل٢٣).

هەر رۆیشت رۆیشت تا گەیشتە رووبارێك لەدەم رووبارەکە راوەستا بۆ ئەوەی پشوویەك بدا، لەسەر لێوی رووبارەکە دانیشت وویستی ئاوێك بەدەم و چاوی بکا، کەداهاتەوە سەر ئاوی رووبارەکە، کلاوەکەی لەسەر

بەربۆوە ناو رووبار و ئاوەکە ڕای پێچاو بردی، ئافۆ بەسەری کۆت و دەستی بەتاڵ مایەوە(گەردی،ل٢٥).

لەدەقە فارسییەکەدا (رود) نوسراوە کە مانای رووبار دەگەیەنێ نەك چۆم، لەدەقە فارسییەکە (کنار رود) نووسراوە کە مانای لێوی رووبارەکە کەچی (حوسامی) نوسیویەتی پەنا چۆمێك ئەو مانایە ناگەیەنێ، حوسامی نووسیویەتی (بەسەری پەتی) لە کوردەواریدا دەڵێن (بەسەری کۆت) بە (پێی پەتی) کەمامۆستا (گەردی-یش سەری کۆت)ی بەکاربردووە.

کابرا ژنەکەی دەرکرد، ژنی تازەی هەم ئاقڵ بوو، هەم کارکەر دەستی بەدروون و چنین و شتی دیکە و شەش مانگی رابرد، خانووی کابرا بوو بە کۆشك (حوسامی،ل٢٦).

کابرای هەژار ژنی یەکەمی لەماڵەوە وەدەرنا، بەلاّم ژنە گەنجەی هەم ژیرو ئاقڵ بوو، هەم چاپووك و ئیشکەریش، هەموو ئیشێکی دەزانی دەستی بە دوورمان و چنین کرد، شەش مانگی پێ نەچوو کوخی کابرای هەژار بوو بە کۆشك و باڵەخانە (گەردی،ل٢٨).

لە دەقە فارسییەکەدا (زن جوانیش) کەبەمانای ژنە گەنجەکە دێت وەکو گەردی ئاماژەی پێ کردووە، نەك ژنە تازەکەی، لەدەقە فارسییەکەدا (همەکار بلدبود)، حوسامی نووسیویەتی شتی دیکە، کە بەمانای هەموو ئیشێکی دەزانی دێت، لەدەقە فارسییەکەدا (کلبە) بەمانای کوخ دێت کە گەردیش هەمان ووشەی بەکاربردووە، کەچی حوسامی نووسیویەتی خانوو.

بابچینە مەزرایە (حوسامی،ل٢٧)

هەستە بچینە ئاقاری (گەردی،ل٣٠)

لەدەقە فارسییەکەدا (بیا بەصحرا برویم)واتە وەرە بابچینە بیابان، مەزرا بە مانای کێڵگە دێت لە مەزرعە وەرگیراوە ئاقار بەمانای ناوچە دێت.

ژنەگەی بردە سەر چالاوێك (حوسامی،ل٢٧).

ژنەگەی بردە سەر لێوی بیرێکی قووڵ (گەردی،ل٣٠).

حوسامی دوو ووشەی قرتاندووە (کنار)بەمانای لێوو (عمیق) کە بەمانای قووڵ دێت، ئەم دوو ووشەیەش دەستەواژەکە جوان دەکەن، گەردی زۆر جوان وەریگێڕاوەو گیانی بەبەردا کردووە.

ژن ماسیەکانی، هەلگرت و بردنیەوە ماڵێ و سووری کردنەوە سووسیشی پێداکرد،(حوسامی، ل٢٩).

ژنە ماسی‌یەکانی هەلگرت و بردنیەوە ماڵێ و لێی‌نان ئینجا ساوارێکی زەریفی لێناو ماسیەکانی خستە بن ساوارەکە(گەردی، ل٣٤).

لەدەقە فارسییەکەدا لەنێوان دوو کەوانە (سوار)نووسراوە کە گەردی بە ساواری وەرگێڕاوە، نازانم حوسامی ووشەی (سووسیشی) لەکوێ هێناوە، وەرگێڕانەکەی گەردی پڕ بەپێستی ووشەکانە، پێ دەچێ (حوسامی)(سوار)ی لێ بۆتە سووس کە بەسەر هەمبەرگەرو گۆرف دادەکرێت.

دەوری سۆسی لەپێش داناو سەری ماسی لەژێر سۆس هاتەدەر(حوسامی،ل٣٠١).

قاپە ساوارەکەی لەپێش داناو سەری ماسی لەبن ساوارەکە دەرهێنا(گەردی،ل٣٥).

لەدەقە فارسییەکەدا (ظرف سوار) نووسراوە کە مانای قاپە ساوار دەگەیەنێ.

ئاقڵی پیاوان هیچ ناهێنێ (حوسامی،ل٣٠).

ئەقڵی پیاوانەی تۆ یەك پووڵی قەڵب ناهێنێ(گەردی،ل٣٥).

لەدەقە فارسییەکەدا (عقل مردانه تویك پول نمی ارزد) حوسامی (عەقڵی پیاوان)ی کردووە بەنەناسراو، بەلام لە دەقە فارسییەکەو وەرگێڕانەکەی گەردی (ئەقڵی پیاوانەی تۆ)ناسراوە.

دیتی شەڕە ژنە(حوسامی،ل٣٢).

دیتی دوو ژنەکەی دەستیان لەتیتکی یەك ناوەو لێك دەدەن(گەردی،ل٣٩).

لەکوردەواری نالێن شەڕە ژنە، بەڵکو دەستیان لەتیتکی ئێکتر ئالاندووە، بەلام شەڕە کەو و شەڕە سەگم بیستووە.

یەك مەڕەکانی بردە ئاغەڵ و یەك ئاگری کردەوەو یەك خەریکی نان سازکردن بوو(حوسامی، ل٣٦).

یەك مەڕەکانی داکردە هۆڕو یەکی تەندوری جۆشداو یەکی هەویری کرد و یەکێ فراوینی لێنا (گەردی،ل٤٤).

تندررا اتش کردیانی تەندوری جۆش دا نەك وەك (حوسامی) ئاگری کردەوەلەدەقە فارسییەکەدا (خمیر گرفت) واتە هەویری چێکرد، ئەم ووشەیە لەوەرگێڕانەکەی حوسامی بوونی نییە.

هەرمەنی و جوو سەری قاپەکەیان لابرد دیتیان نەماوە(حوسامی،ل٥١).

ئەرمەنی و جوو کە تەماشای سینی کەبابیان کرد دیتیان بەتاڵ و حەتاڵە(گەردی،ل٦١).

لە دەقە فارسییەکەدا (ارمنی ویهودی بە ظرف کباب نگاه کردندو دیدند خالی است)وەرگێڕانەکەی گەردی تەواوە، هەروەها حوسامی (جوو)ی کردووە بەنەناسراو، بەڵام لەوەرگێڕانەکەی گەردی کە لەگەڵ فارسییەکەدا دەگونجێ ناسراوە.

کابرای بێ عەبا خۆی دەچۆمێ هاویشت و گوتی هەر ئەوەم بەسەر دەهات کە دەمبینی (حوسامی،ل٥٣).

کابرای بێ عەبا بەهەموو جلوبەرگییەوە خۆی بە رووبارەکە داداو لەوبەری هاتە دەرەوە، سەراپای گیانی لە ئاو هەڵکشابوو بانگی برادەرە عەبادارەکەی کرد، کووم دەبینی ئاوهام لێهات (گەردی،ل٦٣).

بەبەراوردکردنی ئەم دوو دێرە دەردەکەوێ کە حوسامی چەند دەستەواژەو ووشەی قرتاندووە و فەرامۆشی کردووە، لەدەقە فارسییەکەدا (رود) نووسراوە کە مانای رووبار دەگەیەنێ، نەك چۆم وەك حوسامی نووسیویەتی، سێ پەند (حوسامی، ل٥٣)

سێ ئامۆژگاری (گەردی،ل٦٥).

لەدەقە فارسییەکەدا (سە اندرز)نووسراوە کەبەمانای سێ ڕێنمایی و ئامۆژگاری دێت، نەك بەمانای پەند وەك حوسامی نووسیویەتی.

سەر لێوی کەندالێکی گەورە (حوسامی،ل٥٤).

لێواری هەڵدێرێکی بەرز(گەردی،ل٦١).

لەدەقە فارسییەکەدا (بەلب پرتکاە بلندی) وەکو گەردی وەریگێڕاوە بڵند بەمانای بەرز دێت، نەك گەورە.

پیاوی دوو ژنەی بە مەکر (حوسامی، ل٦١).

کابرای دوو ژنەی فێڵباز (گەردی،ل٧٥).

لەدەقە فارسییەکەدا (مرد دو زنەء حیلەگر). بەمانای فێڵباز دێت، یاخود لە کوردیدا دەڵێن (مەکرباز) هەرچەندە (مەکر) فارسەکانیش بەکاری دەهێنن، لەعەرەبییەوە هاتۆتە ناو زمانی کوردی و فارسییەوە.

چۆن ئیرادە بکەی ئاوا دەژی (حوسامی،ل٦٠).

چۆنت بوێ وا دەژی (گەردی،ل٦٧).

ئیرادە ووشەیەکی عەرەبییە هاتۆتە ناو زمانی فارسییەوە، دەبوایە(حوسامی) ووشەیەکی کوردی لەجیاتی ئیرادە دابنایە، چونکە ئیرادە لە کوردیدا مانای زۆرە، بۆ نموونە بەمانای ویستن ، ئارەزوو، بوێ، ڤیان....تاد.

رۆژێك پاشا و وەزیر لیباسیان گۆڕی (حوسامی،ل٦٠).

رۆژێ پاشا و وەزیر بەرگی دەروێشانیان کردە بەر (گەردی،ل٧٦)

لەدەقە فارسییەکەدا (لباس درویشان بەتن کردە)، دیارە لباس لە (ملابس)ی عەرەبییەوە هاتۆتە ناو زمانی فارسییەوە، دەبوایە حوسامی ووشەیەکی کوردی لەجێگای بەکار بهێنابایە، کەلە کوردیدا (پۆشاك و بەرگ)مان هەیە. دەبێ ئەو کەسە زۆر سەیر بێ، چەندە بە غیرەتە (حوسامی،ل٦٢).

کابرا زۆر بەرچاوە و زۆر وێراو نەترس و بەجەرگیشە (گەردی،ل٧٨)

دەقە فارسییەکەی (این ادم بایدخیلی تماشایی باشد،چە دل و جرأتی دارد)

(گەردی) دەقاو دەق وەریگێڕاوە، کەچی (حوسامی) ووشەی سەیری بەکارهێناوە کەلەدەقەکەدا بوونی نییە، سێ ووشەشی قرتاندووە، وەك بەرچاو، وێراو نەترس و ئازا.

چونکە خراپەی فیکر و کردەوەیان بۆ ئەوان بەسە (حوسامی،ل٧٦)

چونکە ئەوەی خراپ بێ ویژدانی و بەد نیهادی خۆی بەسە، (گەردی،ل٩٤).

لەدەقە فارسییەکەدا (بدی نهادشان) لەگەڵ وەرگێڕانەکەی گەردی دەگونجێ، بەهیچ شێوەیەك (خراپەی فیکر و کردەوە) ناگەیەنێ، چونکە نهاد پێوەندیی بەناوەوەی مرۆڤەوە هەیە، هەستی دەروون دەگرێتەوە.

چەمەدانێکی پێبوو(حوسامی،ل٧٨)

جانتایەکی پێ بوو (گەردی،ل؟)

چەمەدان لە (چمدان)ی فارسییەوە هاتۆتەناو زمانی کوردەکانی ئێرانەوە، ئەگینا خورجێنی و باوڵ راسترە.

بەرخێك بکوژینەوە(حوسامی،ل٨٤)

جوانەگایەك سەردەبڕین (گەردی،ل١٠١).

لە دەقە فارسییەکەدا (گوسالەء نری را سرمی بریم).

(گوسالەء) بەمانا جوانەگا دێت وەك گەردی نووسیویەتی نەك بەرخ.

نان و گۆشتی سورەوەکراوە بۆ مێوان ئامادە بکە (حوسامی،ل٨١)

کولێرە بە شەکر بکەو هەندێ گۆشت ببرژێنە بۆ مێوانەکەمان (گەردی، ل١٠١).

له دەقە فارسییەکەدا (قطاب بپز) نوسراوە کە دەکاتە گردەنانی بەشەکر، نەك نان وەك حوسامی نووسیویەتی.

لەپێشدا وەڵام پرسیاری من بدنەوە پاشان خوازبێنی بکەن (حوسامی،ل٩٢)

یەکەم جار دەبێ وەڵامی پرسیارەکەم بدەیتەوە، ئینجا داوام بکەی (گەردی،ل١١٤)

له دەقە فارسییەکەدا (بدهید ، کنید) کە مانای بدەیتەوە، بکەی دێت وەك گەردیش ئاماژەی پێکردووە، کەچی حوسامی کردارەکەی کردۆتە کۆ (بدەنەوە ، بکەن) دیارە لە رووی زمانەوە هەڵەیە.

دیوارێکی لەدەوری خانووەکە کێشا (حوسامی،ل٩٢)

شوورەیەکی بڵندی لەدەوری حەوشەی خانووەکە دروست کرد(گەردی،ل١١٤)

لەدەقە فارسییەکەدا (حیاط خانە) بەمانای حەوشەی خانووەکە دێت وەك گەردی نووسیویەتی، نەك دەوری خانووەکەی وەك حوسامی نووسیویەتی.

پەنا جۆگەلەیەك ڕاوەستان (حوسامی،ل٩٢)

لەدەو رووبارێ وەستان (گەردی،ل١١٥)

لەدەقە فارسییەکەدا (درکنار جویباری توقف کردند) مانای لە لێواری رووبارێ وەستان، نەك پەنا جۆگەیەك وەك حوسامی نووسیویەتی..

سێوێك و قوتوە دەرزییەکی بۆ نارد (حوسامی ، ل٩٥)

سێوێك و جۆرکە شووژنێکی بەکارەکەرەکە بۆ نارد (گەردی،ل١١٨)

لەدەقە فارسییەکەدا _جعبە سوزن) کە بەمانای توورەگەیەك سووژن دێت نەك قوتوە دەرزییەك وەك حوسامی نووسیویەتی.

تۆ پیاوێکی راست و لەخوا ترسی (حوسامی،ل١٠٨)

تۆ مرۆیەکی دەستپاك و ئیماندار و لەخوا ترسی (گەردی،ل١٣٧)

لەدەقە فارسییەکەدا (درستکار)هاتووە کە مانای راستگۆو دەستپاك دەگەیەنێ، نەك راست وەك حوسامی نووسیویەتی (با ایمان)ەکە ئیماندار دەگەیەنێ قرتاندراوە لەلای حوسامی.

گایەکەی جل و لغاوکرد (حوسامی، ل١١١)

جلەو هەوساری لەسەری گایەك کرد (گەردی،ل١٤٠)

ئەسپ لغاو دەکرێت نەم بیستووە گا لغاو بکرێت بەڵکو وەکو گەردی، جلەو هەوسار بەکار دەبرێت.

یوسپ لاوێکی جوان، چالاك، سوار چاك و نەترس(حوسامی،ل١١٥)

یوسپ گەنجێکی بەتاقەت و کۆك، چاپووك و بێ باك بوو، (گەردی،ل١٤٥).

لەدەقە فارسییەکەدا (اصیب جوانی بود، نیرومندو زیباو سواری چابك و بێ باك.

نیرومند)بەمانای بەهێزو بەتاقەت دێت وەك گەردی نووسیویەتی (زیبا) بەمانای قۆز و کۆك دێت، بەمانای جوان دێت، بەلأم بۆ کوڕ دەڵێن گەنجێکی قۆز یاخود کۆك، نەك گەنجێکی جوان.

رایکرد بۆلای یوسب (حوسامی، ل١١٧)

رایکرد چووەوە لای ئەسپەکان (گەردی،ل١٤٧)

ئەدەقە فارسییەکەدا (بەطرف اسبان دوید) وەك گەردی وەریگێڕاوە، حوسامی پەلەپەلی کردووە، ئەسپ و یووسفی لێك جودا نەکردۆتەوە.

دیتی پیرەمێردێکی ڕزیو، ریش سپی دانیشتووە (حوسامی،ل١٣١)

دیتی پیرەمێردێ دانیشتووە، داڕزاوە و هەموو ریشی سپی بووە، (گەردی،ل١٦٦)

لەگوردەواریدا دەڵێن سێوەکە ڕزیوە، پیرەمێردەکە داڕزاوە.

ڕۆژە ڕێیەك لێرەوە دوور، بڕام دەژی، تەمەنی دووسەت ساڵە ڕەنگە ئەو بزانێ (حوسامی،ل١٣١)

برایەکم هەیە، تەمەنی دوو سەد ساڵە و ماڵیشی ڕۆژە ڕێیەك لێرەوە دوورە، بڕۆ لای ڕەنگە ئەو بزانێ (گەردی،ل١٦٦)

ڕستەکەی حوسامی لە رووی ڕێزمانەوە نارێکو پێکە.

پیرێژن بە نەقەنەق هەستاو لبادو باڵنجێکی هێنا (حوسامی،ل١٣١)

پیرێژن بە نا بەدڵیو بە بۆڵەبۆڵ هەستا چوو نیمدەرێك و بالیفێکی هێنا (گەردی،ل١٦٧)

لەدەقە فارسییەکەدا (پیرزن با نارچایی، نق نق کنان) بەنا بەدڵی و بۆڵەبۆڵ ڕاسترە، نەك بە نەقە نەق.

کە هەر ووشە فارسییەکەیە حوسامی نووسیویەتییەوە.

لەسەر رووی خۆی دادەو دەگریا (حوسامی، ل١٣٧)

لەسەر و گوێلاکی خۆی دەداو فوغانی دەکرد(گەردی،ل١٧٤)

سەر رووی خۆی دادە بۆ ژن بەکار دەبرێ بۆ پیاو هەروەك گەردی دەڵێ لەسەر وگوێلاکی خۆی دەدا.

پەندەکانی حەکیمانە (حوسامی،ل١٤٥)

ئامۆژگاری ژیرانە(گەردی،ل١٨٢)

لەدەقـە فارسـیەکەدا ( انـدرزهای حکیمانـە) کـەمانای ئامۆژگـاریی ژیرانە دێت، نەك پەند، چونکە پەند وانەی عیبرەتە.

ئەقڵ و ئیقباڵ (حوسامی ، ل١٥٨)

بەخت و ئاوەز (گەردی،ل١٩٨)

لە دەقە فارسییەکەدا (عقل و اقبال) هەردوو ووشە لە عارەبییـەوە هاتونەتە ناو زمانی فارسییەوە (حوسامیش) وەکوخۆی بـەکاری بـردوون دیارە (عقل)بەمانای ژیـر، بـە ئـاوەز دێـت اقبـال مانـای بـەخت دێـت کـە (گەردی)وەك خۆی ڕاستی وەرگێڕاوە.

هەریەك لە گوندێك دەژیان (حوسامی،ل١٧٦)

ڕاستیەکەی هەریەك لە گوندێك دەژیا.

یارمەتیت دەکا (حوسامی،ل١٨٧)

ڕاستیەکەی یارمەتیت دەدا.

لەقەراغ جۆگەلەیەك دانیشتوون (حوسامی،ل١٧٩)

لەدەم ڕووبارێ دانیشتوون (گەردی،ل٢٢٤)

بە فارسییەکەی (برکنار جویباری) جویبار مانای ڕووباری بچووك دێت، نەك جۆگەلە، چونکە جۆگەلە بەفارسی (جوی اب)ی پێ دەڵێن.

دێو هاواری کرد (جوسامی،ل٢٠٠).

دێو نەڕاندی (گەردی،ل٢٥١)

دێـو هـاوار ناکـات وەك حوسـامی نووسـیویەتی، بـەڵکو مـرۆڤ هـاوار دەکاو دێویش دەنەڕێنێ.

ماڵی پڕ لە مێشوولە بوو (حوسامی،ل٢٠٥)

ماڵی پڕ لە کێچ بوو (گەردی،ل٢٥٧)

بە فارسییەکەی (پراز ساسس بود) ساس بەمانای کێچ دێت نەك مێشوولە، چونکە جاران کێچ لەناو ماڵ پەیدا بوو، مێشوولە لەسەر بان پەیدا دەبێ.

دوو دەستە برا (حوسامی،ل١٧٦)

دوو برای ئاخرەتێ (گەردی،ل٢٢٠)

دەقە فارسییەکە (دوبرادر خواندە) خواندە مانای دوو براکە پێکەوە گەورەبن و لە ڕاستی برا نەبن، بەیەزیدی ئاخرەتی دەگەیەنێ وەك گەردی ئاماژەی پێ کردووە.

لە باڵەخانە وێستاوە و تەماشای جادە دەکات (حوسامی، ل١٨٢)

لە باڵەخانە وەستاوە، چاوی بڕیوەتە ڕێگا (گەردی،ل٢٢٨)

وەستاوە لەچاوگی (وەستان)ەوە هاتووە، وێستان زمانی سەرزارەکییە، جادە بە فارسی مانای ڕێگا دێت، دەبوایە حوسامی وەکو خۆی بەکاری نەهێنێ، چونکە لای ئێمە جادە بەشوێنی قیرتاوکراو دەڵێین.

ئیمرۆ بەدوای گاکێویەکدا ئەسپم غاردەدا (حوسامی،ل١٨٦)

ئەمرۆ بزنە کێویەکم هەستاندو، ڕکێفم لەئەسەپەکەمداو کەوتمە دووی، (گەردی،ل٢٣٢)

لەدەقە فارسییەکەدا (گوزن) نوسراوە، کەمانای بزنە کێوی دەگەیەنێت وەك گەردی نووسیویەتی، نەك گاکێوی وەك حوسامی وەریگێڕاوە و دەستەواژەکەشی ناڕێکە.

ئەی بەد ذات (حوسامی،ل١٨٨)

هەی بەد مەزەبی ناكەس بەچە (گەردی،ل٢٢٥)

لەدەقە فارسییەكەدا (بدذات) كەماناكەی بەد جنس دەگەیەنێ وەك گەردی نووسیویەتی، حوسامی هەر فارسییەكەی گۆستۆتەوە.

كە نانتان خواردو تێر بوون، دەورییەكان بۆ خۆتان هەلگرن پێشكێشتان دەكەین، (حوسامی،ل١٩٣)

كەلە خواردن بوونەوە، هەر كەسە سینییەكە بۆخۆی ببا پێشكەشتان بێ، (گەردی،ل٢٤١)

دەوری بەمانای قاپی پەل دێت كە بەفارسی (دوری)ی پێ دەلێن.

لەدەقە فارسییەكەدا (سینیهارا باخود ببرید) واتە سینییەكان لەگەل خۆتان ببەن، نەك دەورییەكان وەك حوسامی نووسیویەتی.

دیتیان دێو لە كۆلان كوژراوە(حوسامی ،ل٢٠٦)

دیتیان دێوێك تۆپاندراوە(گەردی،ل٢٥٧)

كوژران بۆ مرۆڤ بەكاردێت، بۆ ئاژەل وەك گەردی نووسیویەتی تۆپاندراوە راسترە.

كچێكی دەس لێ نەدراوە (حوسامی،ل٢٠٧)

كچێكی عازەب (گەردی،ل٢٥٩)

بەفارسییەكەی (دختری باكر) كە كچێنیدار دەگرێتەوە، هەر چۆنێ بێ عازەب كەمانای تازە لاوی بالغ كوڕ بێ یاخود كچ كە مێردی نەكردبێ لەدەس لێ نەدراوە باشترە.

لەگەنێكی مسی پڕ لە پلاونان و گۆشت (حوسامی،ل٢١٥)

سینیەكی زیوی گەورەی هێنا پڕ سەری گۆشت و پلاو (گەردی،ل٢٦١)

دەقە فارسییەکە (سینی بزرگ مس) حوسامی جیاوازی بەینی لەگەن و سینی نەکردووە، برزگ کە گەورە دەگەیەنێ فرامۆشی کردووە، وەرگێڕانەکەی گەردی زۆر ڕێك و تەواوە.

لەهەموو لاوە شار وێران بکات، (حوسامی،ل٢٣٧)

بکات هەڵەیە، دەبێ کردارەکە بکرێ بەکۆ (بکەن).

گەیشتە دەریا(حوسامی،ل٢٥٩)

گەیشتە قەراغی دەریاچەکە(گەردی،ل٣٢٤)

لەدەقە فارسییەکەدا (کنار دریامە)نووسراوە کەتەواو لەگەڵ وەرگێڕانەکەی گەردی دەگونجێ.

چونکە (دیارمە) مانای دەریاچە دەگەیەنێ دیارە لە دەریا بچووکترە، بەڵام حوسامی هەستی بەم جیاوازییە نەکردووە،

لەناکاو دەنگی لوور، لووری جانەوەرێکیان بیست (حوسامی،ل٢٦٢)

لەناکاو گوێیان لەدەنگی زیڕەی جانەوەرێك بوو (گەردی،ل٣٢٨)

لووره لوورەکەی (حوسامی) ڕاسترە، چونکە بە فارسییەکەی (زوزه)کە مانای لووره لوور دەگەیەنێ، زیرە بۆ مرۆڤ بەکاردێت.

داری کۆ دەکردنەوە(حوسامی،ل٢٧٨)

چیلکەی کۆ دەکردەوە(گەردی،ل٣٤٨)

بەفارسییەکەی (خرده هیزم و سرشاخه جمع می کرد)

خرده هیزم تەواو مانای چیلکە دەگەیەنێ نەك دار وەك حوسامی نووسیویەتی. لەڕووی زمانەوە کۆدەکردنەوە هەڵەیە دەبێ کردارەکە تاك بێ، چونکە یەك کەس کارەکەی کردووە.

دایە گیان کارت چییە(حوسامی، ل٢٧٨)

نانە گیان چیت دەوێ(گەردی ، ل٣٥٢)

بەفارسییەکەی (ننەجان چەمی خواهی؟) تەواو لەگەڵ وەرگێرانەکەی گەردی دەگونجێ، کارت چی‌یە مانای چ ئیشێك دەکەی جیاوازە لەگەڵ (چەمی خواهی)کە مانای چیت دەوێ.

رایگەیاند کە پاشا مرد (حوسامی،ل٢٨٢)

بلاٌوی کردەوە کە وەزیر مردووە(گەردی،ل٣٥٣)

بەفارسییەکەی (وەزیر مرد)ە، وەکو گەردی نووسیویەتی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە حوسامی لەکارەکەیدا وورد نی‌یە.

لەوێ ئاگریان کردەوە، (حوسامی،ل٢٨٤)

ئەشکەوتەکە ئاگری لێ کرابووەو (گەردی، ل٣٥٦)

بەفارسییەکەی (درغار اتش روشن بود)مانای لە ئەشکەوتەکە ئاگری لێ کرابووەوە وەك گەردی نەك ئاگریان لێ کردەوە.

لای رۆژئاوا (حوسامی،ل٢٨٤)

بەرەبەری رۆژئاوا (گەردی،ل٣٥٦)

بەفارسییەکەی (هنگام غروب) بەرەبەری رۆژئاوا کە دەکاتە کاتی رۆژئاوا دەگونجێ، بەلاٌم لای رۆژئاوا مانایەکی تر دەگەیەنێ.

ئاو لەسەر خیزەو سوپاس بۆ خودا خیزیش نابزوێ (حوسامی،ل٢٨٩)

ئاوەکەش لەسەر بەردەو بەردەکەش سوپاس بۆ خودا لەجێی خۆی نابزوێ(گەردی،ل٣٦٢)

دەقە فارسییەکەی (روی ریگ) بەمانای وردەبەرد دێت، بەلاٌم خیز بەمانای زیخ دێت.

کیژەکەی لەخەو هات (حوسامی،ل٢٩٠)

کچەکەی لەخەوا دی (گەردی، ل٣٦٣)

دەقە فارسییەکەی (دخترك را بە خواب دید) کیژەکەی لەخەودا بینی کەلەگەڵ وەرگێڕانەکەی گەردی دەگونجێ، بەلاّم وەك حوسامی کیژەکەی لەخەوهات هیچ مانایەکی نییە و دەستەواژەیەکی ناڕێکە.

سەرچاوەکان


١. هەژار ، هەنبانە بۆرینە ، تهران ، ١٩٨٨.

٢. و. گەردی ، ئەفسانەی کوردی، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی - ٢٠٠٠.

٣. و . کەریمی حوسامی ، ئەفسانە کوردییەکان، چاپخانەی دەزگای گولان، ستۆکهۆلم، ١٩٩٩.

گرداوردەءم ب رودنکو، ترجمەء کریم کشاورز، افسانەهای کردی، انتشارات اگاه، تهران، ١٣٥٢.

## زەکی هەناریو وەرگێران

کە دەڵێین وەرگێڕان واتە وەرگێڕانی بەرهەمێك لە زمانێك بۆ زمانێکی تر بەشێوەیەکی پوخت وڕازاوە بەمەرجێ تامو چێژی بەرهەمەکە لەکاتی وەرگێڕاندا نەفەوتێ.

ئەگەر لەم سوچەوە سەیری ئەو بەرهەمە ئەدەبیانە بکەین کەمامۆستا زەکی ئەحمەد هەناری لە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی و فارسی و تورکی یەوە وەریگێڕاون بۆ سەر زمانی کوردی، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مامۆستا زەکی لەهونەری وەرگێڕاندا دەستێکی باڵای بووەو گۆی خۆی لەهونەری وەرگێڕاندا بردۆتەوەو سەرکەوتنی بنچینەیی وەدەست هێناوە.

هۆی ئەم سەرکەوتنانەشی ئەوەبووە شارەزایی ولێ هاتوویی باشی لەهەر چوار زمانەکەدا هەبووە، چ لەڕووی گفتوگۆ کردنەوە بووبێ یان لەرووی نووسینەوەدا.

بەردەوام بەهەر چوار زمانەکە شاکاری ئەدەبی خوێندۆتەوە، وەئەو بەرهەمانەی کاری تێکردووە لەگەڵ تاسەو ئارەزووی گونجاوە و هەست و نەستی بزواندوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی زگماك.

بە پەخشان گەلێ بەرهەمی ئەدەبی وەرگێڕاوە لەوانە گوڵستانی سەعدی شیرازی لە فارسییەوە کردووە بە کوردی، ساڵی ١٩٦٨ لەبەغدا چاپی کردووە سەرگوزشتەی ژیانی محەمەد (د.خ) ڕێکخستەی ئیدن هۆلاند لەئینگلیزی یەوە گۆڕیوە بۆ کوردی هێشتا چاپ نەکراوە.

هەروەها گڕامەری زمانی کوردی لە ئینگلیزیەوە کردووە بەکوردی کەنووسەرێکی ئەمریکی نووسیوێتی.

جگە لە چیرۆکەی منداڵان کەلە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە بۆ کوردی هێشتا چاپ نەکراوە.

وەبە شیعر گەلێ شاکاری جیهانی وەرگێڕاوە، لەزمانی فارسی شاکارەکانی سەعدی شیرازی و حافزی وەرگێڕاوە.

لە ئینگلیزی شاکارەکانی ڤیکتۆر هۆگۆ و ولیەم شکسپیری وەرگێڕاوە.

جا لێرەدا یەك دوو نموونە لە بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی دەخەینە بەرچاو خوێنەرانی ئازیز، کورد واتەنی (مشتێ نموونەی خروارێکە).

بەهیوای لەدەرفەتێکی تردا بەدرێژی بلاّوییان بکەینەوە رازو نیازی گوڵ هۆنراوەی ڤیکتۆر هۆگۆیە لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە، بەم شێوەیە دەست پێ دەکات.

رازو نیازی گوڵ

گوڵێکی تازە پشکفتوی قەشەنگ
بەم پەروانەی وت لەسەرخۆ بێ دەنگ
کەسوك لەگەری نسێ دا ئەفڕی
باڵی ڕەنگینی نەسیمی ئەدڕی
دڵدار ! هاودەمی شەوی تاریکم
دۆستی ئەمەکدار بۆ جوانی ڕێکم
وەرە پێش وەرە، خۆت دوور مەخەلێم
لەم جیهانەدا تۆی کە بچی پێم
لەمیانەی بونو نەبون سەرگەردان
پەنجەی بە تێنی چارەنووس لێمان

ناگەڕێ ، زینهار، مەبە دڵ نیا

بەزوویی ئەی وێ لێکمان کا جیا

ئەو کاتە هەتا هەتایێ ئەمن

ئەڕۆم ، نامێنم لێتان ئەبم ون

بە ئاگاوەرە ! ژیانی مە تەنیا

کورترە لە ژیانی گش شتی دنیا

پاش چاو قووچێنێك چاودەی بڕاوە

ریشەی ژیانم، گەلام پچڕاوە

گۆڕی دڵداری چەن تەنگە گیانە!

ژەی خۆشەویستی کورتەو لەبڕانە

خۆزیا بۆ ئەمەی لەدڵداریێك

خۆشیمان دیبا لە یەکتر کەمێك

تۆلە دەماری باریکی تەنم

جێت ئەگرت ئەم ووت لەم شادیە منم ؟

لەم باڵە گچکەی ڕەنگینانەی خۆت

ئەتدامێ دیاریەك تا من ماوم بۆت

ئەمەش نموونەیێکی ترە لە شیعری ولیەم شکسبیر لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردی.

ئەمە خۆ دوور نیيە رۆژێ ئەستێرەکان

بەیێك بکەون، پڕ بڵێسەکەن جیهان

نبتۆن و ئۆرانۆس لێك دەن و لەناکاو

لە چەرخەوە بۆ زەمین تاویدا کیوان (١)

رۆژ ساردو بکوژێتەوە، لە جێی ئەوا

(٢)سهـا لـوبـدا، سهيـل(٣) بێتـه تـابـان

ئـهمـانـه دوور نین ببن بهڵام ئهبته دوور

دڵـداری تـۆم لـهسـهرا دەرچـی هـهی گیان!

له ئهدەبیاتی سهعدی شیرزای (دووانی مۆم و پهروانه)ی وەرگێڕاوە.

دووانـــــی مـــــۆم و پـــــهروانـــــه

لــه یـادمـه شـهوێ چـاوم نــهچـــووە خـــهو

بیـستـــم پــهروانــه بـه مــۆمـی ی ووت شهو

منێکـی دڵـــدار بســـووتێـــم حـــهقـــه

گــریـــان، ســووتــانــت چـــیـیـه بـێ نـقـه؟

وتــی دڵـدارەی ! بـێ تـــهنـــهکـــهی مـــن

شیـرینـی رۆیـی یـار شیـــرینـــهکهی مـــن

کــهشیـریـن رۆیـــی لــهمــن ســهر لــهبــهر

وەك فـهرهـاد ئـاوی دائـــهڕژێ لـــهســـهر

ئـهی گـۆت و هـــهر کات فرمێسکـی پـڕ دەرد

ئـههـاتــه خـــوارێ بـــهســـهر ڕویـــی زەرد

ڕەوای یـهکێـکـــه دڵـــــداری کـــــردن

خـــۆی بگـــرێ بـــێ دەنــگ هـهتـاکـو مردن

تـۆ هـهڵـدێـی لـهپێش گـڕێکـا هـهی خـاو

وەستـــاوم تـــا ئـــهســـوتـێـــم تـــهواو

بـــه ئـــاگـــری دڵـــداری گـــهر بسـوتـێ پهڕ

١. زحل

٢. بنات النفس

٣. کاروان کوژ

مـن بینه سوتاوم لەپێ هەتا سـەر
ئەدواو ئـەسوتـا دوو کەڵی لـەسـەر
دووایـی دڵـداری وایـه بـێ خــەبــەر
فیـدایـی له ئامانج هەڵناگرێ چەنگ
ئـەگـەر بـۆ سـەری تیر باری یا سەنگ
پـێـت ئـەڵێـم نـەکەی بچیه ناو دەریا
کـه چـووی خـۆت بـده دەس لافاویـا
ئەمەش نموونەیێکی تره له شیعری فارسی وەرگێڕاوه بەناوی
(گفتوگۆی بولبول و پەروانه)
بیـستـم پـەروانـه لـەم کاتـەی بـولبول
ئـەی نـالآنـد لـەتـاو دەردی عشقی گوڵ
پـێی ووت ئـەم بـانگ و هـاوارەت چی‌یه؟
لـەدەسـت معشـوقـەت ئەم کارەت چی‌یه؟
پێــویـستــه عــاشقـی لـەمنەوه فێر بن
کــه هیــچ نــانــاڵم لــەکــاتـی سـوتـن
ئـەمــەی بیـست بـولبول گریاا پڕ بەزار
کـەمـن بــەخـت ڕەشم ئـەتۆی بەختیار
بــەخـتــت یـاوەرەو خـۆشی و خـەنـدەی
که گیان لەژێر پێی مەعشوقەت ئەدەی
هیـچ کــەس بـەحـاڵی من نەبێ خودا
یــارم لــه پێـش چـاو ئـەدرێتـه بەربا
پێـویـستــه لـەسـەر ئـەم ژینەم گریان
کـەبـێ یـار ئـەبـێ بـەڕێ کـەم ژیــان

ماتەمینی سەر منارە

شیعری : موسی الخافور ((۱))

وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە کەمال مەعروف

لەهەولێر...

لەنێوان ئاژاوەی چەکدا

کەلەپوورو...

ووشە رەنگاو رەنگەکان نسکۆیان دا

(۱)

سەرەڕای نالینی خۆم

ئازارەکانی عیراقم هەڵبژارد

ئای چەند ماندوو بوویت و

ئای چ ئازایەتییەکت هەیە.

(۲)

رۆژێك لە هەولێرا

لە دەست گوشینی باڵندەکانا

کازیوە مانگی گرت

چۆلەکەکانی رووبار....گریان

خەم... فرمێسکەکانی مانگە شەوی رێکخست

ئەو رۆژە ...

منارەکان و ...

بێچووە لەق لەقە بێ دایکەکان و

هەولێر بوونە ماتەمینی.

(۳)

لەو رۆژەدا...

مناره‌كان..

ئازارێكیان نۆشی

خه‌مێكیان هه‌ڵگرت... كه‌ لێی نووسرابوو:

له‌ پێناوی عیراقدا له‌ق له‌ق دێت و

تێیدا ده‌مرێت

كاتێ باڵه‌كانی له‌ق له‌قه‌كه‌م له‌بن هه‌نگڵم نا....

ویستم بڕۆم

هه‌ستم كرد.... كه‌ كوڵله‌ی زه‌وی ژماره‌یان زۆره‌(٢)

١: موسى الخافور : شاعیر و به‌رهه‌ڵستكاری عیراقی‌یه‌، ئێستا له‌ دیمه‌شق نشته‌جێ یه‌.

٢.موسى الخافور: ترانيم زهرة الهياسنث، دار الينابيع - دمشق، ١٩٩٥.

## رۆژنامەگەری کوردی لە ئەوروپادا

رۆژنامەگەری کوردی لە دەرەوەی وولاّتدا لە کەشو هەوایەکی ئازاد پەخش و بلاّو دەکرێنەوە، نووسەرانی کوردیش بەوپەڕی سەربەستیەوە بێ هیچ سانسۆرێك بیروباوەڕی خۆیان دەخەنە ڕوو، لە رووی ناوەرۆکەوە گەلێ بابەتی بڤەو دیاردەی دزێوی ناو کۆمەڵ کە لەوولاّتدا نووسەران خۆی لێ لاتەریك دەکەن، لەبەر گەلێ هۆی ئایینی و سیاسیەوە، ئەوا لە دەرەوەی وولاّتدا بێ هیچ پەروایەك کارە ناڕەواکان تیشك و رووناکییان دەخرێنە سەر بۆ خەڵکی روون دەکرێنەوە، بەلاّم لە رووی رووخسارەوە تەکنیکی هونەرییان لەئاستی گۆڤارەکانی وولاّتانی ئەوروپادا نین، لەهەر ولاّتێك لە ولاّتەکانی ئەوروپا چەند گۆڤار و بلاّوکراوەیەکی کوردی هەن، بزوتنەوەی رۆشنبیری بەهۆی رۆژنامەگەرییەوە لەدەرەوەی ولاّتدا هەنگاوی مەزنی بەخۆیەوە بینیوە، ئەوەی جێگەی داخە کە گۆڤارەکانی دەرەوەی ولاّت لەهەڵچوون و داچوون دان، هەندێکیان دوای ئەوەی کەیەك دوو ژمارەی لێدەردەچێ وون دەبێ، گۆڤارێکی تر سەر هەڵدەداتەوە، ئەم تەمەن کورتییەی گۆڤارەکانیش بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە، لەسەرووی هەموویانەوە:-

١. نەبوونی کادیری کوردی وەکو پێویست لەبوارە جیاجیاکاندا.
٢. نەبوونی گیانی هاوکاری و دۆستایەتی لەنێوان رۆشنبیرانی کوردیدا.
٣. سەرقاڵی خەڵك بەئیش و کاری رۆژانەوە، ئەمەش وایکردووە کەهەندێك لە رۆشنبیران نەپرژێنە سەر ئەوەی کە بە نووسینەوە خەریك بن.
٤. مەسەلەی ئابووریش خاڵێکی گرنگە بۆ بەردەوامبوونی رۆژنامەو گۆڤاری کوردی لە دەرەوەی ولاّتدا، هەروەکو ئاشکرایە بلاّوکراوەکانی

کوردی یان بە پاڵپشتی حزبەکانەوە دەردەچن، یاخود بە یارمەتی وڵاتە ئەوروپییەکانەوە پەخش دەکرێن، بەشێکی کەمیشی بەهاریکاری کوردەکانی دەرەوە دەردەچێت.

٥. زۆر جار کەمی خوێنەر گیروگرفت لەبەردەم دەرچوونی گۆڤاری کوردیدا چێدەکات، چونکە رۆژنامەگەری کوردی بە خوێنەرەوە بەرەو پێشەوە دەچێ، کە خوێنەری نەبێ ناتوانێ بەردەوام بێ.

٦. دوو بەرەکیو ناکۆکی ناوەوەی وڵات، لە دەرەوەی وڵاتدا ڕەنگی داوەتەوەو زۆر جار چەند رۆشنبیرێك لەوڵاتێکی ئەوروپیدا دەژین بەڵام ناتوانن پێکەوە کاربکەن، ناچار دەبن بەتەنیا گۆڤارەك دەربکەن، بەتەنیاش هەر دوو سێ ژمارەیان پێ دەردەچێ و پاشان گۆڤارەکە وون دەبێ، بۆ نموونە گۆڤاری (وان، مامۆستای کورد، رۆناکبیری، خەرمانە) لەوڵاتی سوید دەردەچوون لەبەر ئەم خاڵەی سەرەوە ئێستا دەرناچن.

٧. لەوڵاتێکی وەکو سوید ئەگەر چوار ژمارە لە گۆڤارێك دەربکەی و گۆڤارەکەش لەئاستێکی باش بێ ئەوا لەلایەن حکومەتی سویدییەوە هاریکاری ئابووری دەکرێت، زۆر جار هاریکارییەکە وەردەگرن پاش دەرکردنی چوار ژمارەکە ئیتر لفی لێدەدەن و بێ دەنگ دەبن.

٨. نەبوونی پەیوەندی لەنێوان رۆشنبیرانی دەرەوەو ناوەوەی ووڵات، ئاستەنگێکی گەورەی دروستکردووە، چونکە بڵاوکراوەکانی دەرەوەی وڵات ناگەنە کوردستان و بڵاوکراوەکانی کوردستانیش وەکو پێویست ناگەنە دەست خوێنەرانی کورد لە دەرەوە.

## ئاستەنگەکانی رۆژنامەگەری کوردی

لەپاش راپەرین رۆژنامەگەری کوردی گۆڕانێکی هەمەلایەنەی بەخۆوە بینی، هاتنەکایەی رۆژنامەی رۆژانەو دەرچوونی جۆرەها گۆڤار و بڵاوکراوە، بە وەرچەرخانێکی مەزنی بواری رۆژنامەگەری دادەنرێ، شۆڕشی زانیاری، گەشەکردنی ئامرازەکانی وەرگرتن و ناردن و پەیوەندی کردن و گواستنەوە، ئەم ئامرازە تازانە رۆڵێکی باشیان لە پێشکەوتنی رۆژنامەگەریدا بینیوە، بەکەمترین ئیش و زۆرترین بەرهەم دەست دەکەوێت، جاران دەنگوباس لەرێگای رادیۆ و پەیامنێرەوە دەگوێزرایەوە، بەڵام ئەمرۆ بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیاو ئەنتەرنێت و سەتەلایتەوە فراوانترین هەواڵ کۆ دەکرێنەوە، گەشەکردن و پەرەسەندنی رۆژنامەگەری لەرۆژگاری ئەمرۆدا بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە.

پێشکەوتنی باری ئابووری لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە زیادبوونی رێژەی خوێندەواری، ئەوش وایکردووە کەخەڵکێکی زۆر رۆژنامە بخوێننەوە، بۆیە پێویستە ئارەزووەکانی، بیروڕاکانی، پێشنیارەکانی لەبەرچاو بگیرێ، لەگەڵ ئەوەی رۆژنامەگەری کوردی هەنگاوی مەزنی بەخۆوە بینوە، دیارە لەکەموکورتیش بێبەش نییە، جالێرەدا هەندێ لەگیروگرفتەکان دەخەینە ڕوو بەو هیوایەی لەدوا ڕۆژێکی نزیکدا چارە سەر بکرێن...

١. نەبوونی لێکۆڵینەوەی رەخنەگرانە وەکو پێویست کەبتوانێ باری سیاسی و کۆمەڵایەتی دواکەوتووی نەتەوەکەمان بە شێلگێرانە هەڵسەنگێنێ.
٢. گیروگرفتەکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری ناخەنە ڕوو، زۆر ڕووداو و کارەساتی کۆمەڵایەتی و سیاسی هەنە رۆژنامەکان خۆیانی لێ

لاتـەریك دەكـەن، پـەردە پـۆش كردنـی هەنـدێ دیـاردەی دزێـوی كۆمەڵایەتی و شاردنەوەی لـە میللـەت كارێكی بـاش نـیـە پێویستە خەڵكی ئاگای لەهەموو ڕوداوێكی بچووك و گەورەی وڵات بێت، تاكو بتوانێ خۆی بپارێزێ و هۆشیار بێتەوە.

٣. ڕۆژنامـەكانی كوردسـتان، ڕۆژنامـەی حزبـە دەسـتەلاتدارەكانی كوردستانن، ئـەوەش ئـەوە دەگەیـەنێ كـە ڕۆژنامـەی سـەربەخۆ و ئازادمان ئیمرۆ لەكوردستاندا نـیـە.

٤. سەربەستی ڕۆژنامە پەیوەندی بـە سەربەستی گشتیـیەوە هەیـە، تـا وڵات ئازاد و یاسا بەرقـەرار نـەبێت، ڕۆژنامـەی ئـازاد نایەتـە ئـاراوە، چونكە ڕۆژنامەی ئازاد، مانای دەربڕینی ئازاد دەگەیەنێ، ڕۆژنامـەی ئـازاد دەرمـانی گشـت دەردەكانـە، بـەبێ بـوونی ڕۆژنامـەی ئـازاد ڕاستیەكان لە میللەت دەشاردرێنەوە، ڕووداوەكان كپ دەكرێن، وەكو پێویست ناخرێنە ڕوو.

٥. لێكۆڵینـەوەی بابـەتی سیاسـی وەكـو پێویسـت نـیـە، ڕووداوەكـانی جیهانی شیكردنەوەیان لەسەر ناكرێت، تەنیا دەنگوباسەكانە بەهۆی سەتەلایتەوە وەردەگێڕدرێن.

٦. دووبارە بوونەوەی هەواڵەكان، هەنـدێ لەهەواڵەكان مـردوون، یـەك دوو هەفتـە بەسـەریدا تێپـەڕیوە، بەتایبـەتی ئـەو هەواڵانـەی كـە لەلایەن بڵاوكراوەی ڕێكخراوەكانەوە پـەخش دەكـرێن، هـەواڵ دەبـێ تـازە بـێ و درێـژدادڕ نـەبێ، لەهـەمان كاتـدا بزوێنـەر و سـەرنج ڕاكێشەربێت، كـۆن بـوونی هـەواڵ هـیچ نرخێكـی نـامێنێ، پێویستە هەواڵـەكان وەكـو خـۆی بەئەمانەتـەوە بڵاوبكرێنـەوە، بەداخـەوە

هەندێ لەهەواڵەکان دەسکاری دەکرێن، کەلە سیما هەرە گرنگەکانی ڕۆژنامە ئەوەیە ڕاستگۆیی پەیڕەو بکات.

٧. ئەو کادیرانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا کاردەکەن، زۆربەی زۆری خاوەن قەڵەمن، واتە ئەدیب و شاعیرن، کادیری هونەریمان ئێکجار کەمن لەبواری ڕۆژنامەگەریدا، نەبوونی کادری پسپۆر کەلێنێکی دیارە. کردنەوەی ئامۆژگای ڕۆژنامەگەری لەکوردستاندا، دەبێ سەرەتایەك بێت بۆ چێکردنی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان.

٨. زمانی ڕۆژنامە دەبێ ساکار و سادە بێ زمانی هەموو خەڵك بێ بەتایبەتی بابەتە سیاسیەکان، شێوازی نووسینی بەجۆرە پیتێك بێ کەهەموو کەس بتوانێ بیخوێنێتەوە، پیتەکانی چاپ نابێ زۆر وورد بن، بەداخەوە ڕۆژنامە هەیە، ئەگەر تەلسکۆب لەچاو نەکەی، ناتوانی بیخوێنیتەوە.

٩. بوونی هەڵەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەگەری کوردیدا، بە ئاستەنگێکی گەورەی دادەنێم، بەلای منەوە بوونی ئەم جۆرە هەلانەش لەبەر نەزانی و بێ بایەخی و کەمتەرخەمی ڕوودەدەن، ئەم هەموو هەلانە لەنرخی بەرهەمەکان کەم دەکەنەوە، پێویستە بەرلە چاپکردنی، چەند کەسێکی زمانزان و شارەزا پێدا بچێتەوە، پەلە نەکرێ لەدەرکردنی، کادری هەڵەچنی لەهەموو کادرەکانی دیکەی بواری ڕۆژنامەگەری گرنگترە، لە ئەورووپا کاتێ بەرهەمێك لە گۆڤارێ چاپ دەکرێت، نوسخەیەکی بۆ نوسەرەکە دەنێرێتەوە، تاکو بەسەری دابچێتەوەو هەڵەکانی ڕاست بکاتەوە، خودی خۆشیان چەند جارێك پێدادەچنەوە پاش ئەوەی پاکنووس دەبێت ئینجا بڵاودەکرێتەوە.

١٠. دابەش نەکردنی مادەکان بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێشەر بۆ نموونە ناونیشانەکان، وێنەکان..هتد، هونەری نەخشەسازی پەیڕەو ناکرێت.

١١. نەبوونی هونەری کاریکاتێری، هەر وەکو ئاشکرایە هونەری کاریکاتێر جەماوەرێکی گەلێ بەرفراوانی هەیە، هونەرێکە بەخێرایی و بە ئاسانی دەگاتە خوێنەر.

١٢. وێنەی ڕەنگاو ڕەنگ چاکتر پاڵ بەخەڵکەوە دەنێ کە بایەخ بە بابەتەکان بدەن، بەداخەوە ئەم لایەنەش لەلای ئێمە لەبەر هۆی تەکنیکی تا ڕادەیەك پشتگوێ خراوە، لەهەمان کاتدا نابێ ژمارەیەکی زۆر لەوێنە بخرێنە ڕوو، پێویستە وێنەکان بەوردی لەشوێنی خۆی و بۆ مەبەستی تایبەتی بەرچاو بخرێ.

١٣. بەشێك لە ڕۆژنامەکان بایەخ بە وێنە نادەن دیارە وێنە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە ڕۆژنامەدا، لەلایەك ڕۆڵی ڕوونکردنەوە دەبینێ، لەلایەکی دیکەوە بابەتەکە بەپێزترو سەرنج ڕاکێشتر دەکات.

١٤. ڕۆژنامەکان بایەخ بە ئەرشیف وەکو پێویست نادەن، بۆ پارێزگاری کردنی ئەو وێنانەی کەلەلایەن خەڵکەوە بۆیان دەنێرن، زۆر جار لەگەڵ نووسیندا وێنەم هەناردووە، وێنەکەیان بڵاونەکردۆتەوە، کاتێ داوای وێنەکەم کردۆتەوە گووتویانە نەماوە.

١٥. ڕۆژنامەنووس دەبێ سەرچاوەی هەواڵە نهێنیەکان بڵاونەکاتەوە، هەروەها ئەو نووسەرانەی کەبەناوی خۆیان بڵاوناکەنەوە نابێت لەلایەن خوێنەرەوە ئاشکرا بکرێن.

١٦. زۆر بەرهەمی فەلسەفی و دەروونناسی بڵاودەکرێنەوە، نوسەرەکە پەنجە بۆ سەرچاوەکەی ڕاناکێشێ، بابەتەکان دیارن کە وەرگێڕدراون و ئامادەکراون، خۆ ئەگەر نووسەری کورد بتوانێ بیست لاپەرە

لەبابەتی فەلسەفی بنووسیٚ، ئەوا لەماوەیەکی کەمدا دەبینە خاوەن فەیلەسوفی خۆمان، پێویستە ئەم جۆرە بابەتانە بەبیٚ سەرچاوە بلاْونەکرێنەوە، خودی سەرنووسەران لێی بەرپرسیارن.

١٧. پاشکۆی هەفتەنامەکان، هەر بۆ پڕکردنەوەی لاپەڕەن، چونکە بابەتی زۆر لاواز و بیٚ پێز بلاْودەکرێنەوە، بۆ نموونە وەرگێڕان نازانرێت لە چ زمانێکەوەیە تەنیا پیتی (و) دەنووسرێت.

شیعری زۆر ساکار و سادەو بیٚ مانا پەخش دەکرێن، گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی نەناسراو ئامادە دەکرێت، بیٚ ئەوەی هیچ بەهایەکی ئەدەبی هەبێت، بە ئاشکرا دیارە دۆستایەتی و برادەرایەتی لەبەرچاو گیراوە، ئەم جۆرە کارانەش نە هاندانە، نە خزمەتکردنە بە ئەدەبی کوردی.

١٨. نەبوونی شێوازی گاڵتەجاری و قۆشمەبازی کە بوونی لە ڕۆژنامەدا زۆر پێویست و گرنگە بۆ زاخاوی مێشك و کاتی پشوودان.

١٩. نارێکی بارستایی ڕۆژنامەکان، نووسخەیەك کورتە، نوسخەیەکی تر درێژە، ئەمەش لە کاتی بەرگکردنی دا گیروگرفت چیٚ دەکات.

## شاعیرانی کورد

## نالی شۆڕەسواری مەیدانی هۆنراوەی کلاسیکی کوردی

وا دەزانم هەر چەندە لەسەر نالی بنوسرێت ناتوانرێ بگاتە ئاستی هۆنراوەکانی چونکە لەگەڵ ناوەکەیدا هێلی کلاسیکیەت وەك بروسکەیەك تاریکی ئەو کاتە رۆشن دەکاتەوە ودەبێتە نیشانەی ڕوونی ئەو سەردەمە. ئەو پارچە هۆنراوەی کە ئێستا لەبەردەستمانایەو لێی دەدوێن، ئەگەر تۆزی شەن وکەوی واتا گوزراەکانی بکەین، لەوانەیە بتوانین تۆزە سەرنجێ هەڵێنجین لەو دەریایە بێ بنە فراوانە، نالی وەکو (ابو تمامی) عەرەب زۆر خۆی خەریك دەکا بە وردەکاری وئەم جۆرە هونەرەوە لەگەڵ جیاوازی یەکا، کە نالی تەبعێکی ساف وڕەوانو ڕۆشنی هەیە و زۆر لەم وردە کاریانەشی بێ خۆ خەریك کردنێکی قوول بۆی بەدەست دێت کە ئەمەش وا ئەزانم لەبەر چەند هۆیەکی بنەرەتی بووە

١ – ئەو جۆرە هونەرە مۆدەی سەر دەم بووە وشاعیر پایەی پتر پێ بەرز بۆتەوە.

٢ – زۆر زانین وڕۆشن بیری لەزمانی عارەبی وفارسیدا.

٣ – خۆ دەرخستن وشانازی پتر بەخۆوە.

٤ - شاعیریەتێکی قووڵی زگماك.

ئەوەی کە لێرەدا پیتۆڵی نالی وەدەرئەخا ئەوەیە کە نەی ویستووە ستایشی (ئەحمەد پاشا) بکا، چونکە پاشای تازەیە وفەرمانڕەوایی نوێیە لەسەر حسابی (سلیمان پاشا) کە ئەو کاتە مردووە وهیچ هیوای پێی نەماوە، واتە ستایشی هەردووکیان دەکات بە شێوەیەکی گشتی، بەلام لە هەندێك شوێنا تۆزە بەرزی ونزمیەك لەمیانی ئەم دوو پاشایەدا پێشان دەدا ئەمەش بەلای منەوە (نالی) بەدەستی ئەنقەست خۆی دروستی

کردووه، چونکه ئەگەر زیاتر بە سلێمان پاشادا هەڵدات شانازیيە بۆ ئەحمەد پاشا چونکه ئەمیش هەر لەو وەچەیەوە دەچێتەوە سەر سلێمان پاشا. لە دێری یەکەمدا سلیمان پاشامان بۆ دەخاتە پلەی ئەستێرەیەك لە شەوێکی مەنگی تاریکی لێلاّ وئەم ئەستێرەیەش نایەوێ ئاواببێ وهەرگیز مل نادا هەتا فەلەك لێی هەڵ نەپێچێ ونوغرۆیی نەکا، بەلاّم لەگەڵ ئاوا بوونیشیا ئەو شەوە بە تارێکی نامینێتەوە ئەستێرەیەکی تر هەیە کە جێگای بگرێتەوەو شەو تاریکەکەمان بۆ دەکاتەوە بە مەشخەلاّن، سروشت وکردگار هەموو خەریکن بە مردنی (سلیمان) ەوە، ئاسمان دەگری وقوڕ دەپیوێ، تەم ومژو تاریکی هەر چوار لای ولاّتی گرتۆتەوە، شاعیر ئەم هەموو ناخۆشیەی کردووە بەهۆیەك بۆ ئەنجامێك، ئەنجامەکەشی گەشی وجوانی ئەو باخەیەو پێکەنینی و شکۆفەی گوڵەکانیەتی، سلیمان پاشای بۆ کردووین بەو درەختە پیرەی کە بنەڕەتی هەموو نەمام ولق وپۆپێکی تازە وناسکە ئەم درەختە پیر بووە وسەری سپییە، بەلاّم چەمەنی جوان و پاراو سەرهەڵ دەداو ئەو درەختە پیرە دەشارێتەوە ونەپروێ. ئەمەیە دیالکتیکی گۆڕانی ژیان زۆرانبازی لەمیانی کۆن ونوێ دا کۆن ئەپروێو تازە جێی دەگرێتەوە، بەلاّم چ تازەیەك کە وەك ئەمامەکەی نالی لەسەر بنجی کۆتەرەدارەکەی دایکی هەڵ بداو بەری جوان وسێبەری گەش ترمان بۆ دروست بکات.
ووشەی (سلیمانان) بەڕای من تەوریەیە چونکە مەبەستی دووریی حەزرەتی سلیمانە کە خاوەنی گەورەترین تەخت بووە، کە سلیمان پاشای خستۆتە پایەی حەزرەتی (سلیمان) لە دەستەلاّت وهێزدا، بەلاّم دوایی سلیمان پاشا تەختەکە هەر چۆڵ نەبووەو یەکێکی بە دەستەلاّتر جێگای گرتۆتەوەو (تەخت ارا) بووە، لەدێری (قصەیی ... هتد) شاعیر

خۆی پێمان دەڵێ کەوا دەبەوێت پەنابەرێتە بەر کینایەت بەڵام وا دیارە کینایەتە، بۆیە خۆی لەیەك جار پێمان ڕادەگەیەنێ یان هەر دەیەوێت یەکەم جار بەناوی داوا کردنەوە خۆی بپەرێنێتەوە چونکە دەڵێت دادپەروەرێکی وایە کەکەس نیە (عەدیلی) بێت واتا (یعدل عنە) جێی بگرێتەوە ئەم مانایە گونجاوترە.

بێگومان کە یەکێك ئەوەند لای شاعیر پایە بڵندو بەدەستەلات بێت دەبێت (مورغی روحی) واتە باڵندەی گیانی لە بۆ بەهەشت (جنە الماوی) زیاتر ڕوو بۆ هیچ شوێنێك نەکات. (دێڕی وەك قیاسێکی...) پەنجە درێژ کردنێکی شارەزایانەیە بۆ زانیاری (مەنطق) کەمەبەستەکەی ئەوەیە لەجێی هەموو ڕووداوێك ڕووداوێکی تر دێت، کە ئەو ڕووداوەی تر ئەنجامی ئەوەی پێشووە. شاعیر سوپاسی خودا دەکا کە چۆن ئەو ئەنجامە وەك پێوانەیەك بەموو لای نەداوەو هاتۆتە دی.

(شاکە عالی جابوو)، جا مەبەستی جێگەیە یەعنی سلیمان پاشا جێگەو پایەی بەرز بوو سوپاس بۆ خوا کە (خالی جا) واتە جێگەکەی خالی نەبوو.

لەکۆتاییدا شاعیر مێژوویی مردنی سلیمان پاشا ئەنووسێ بە رستەی (تاریخی جەم) کە مانای جوانی دێڕەکە لە نیوەکەی تریدا سەرهەڵ دەدا کە وێك چوواندنی (سایمان)مان بۆ دەکا بە ئەسکەندەری زولقرنین یان مەکدۆنی لە دەستەلات وتوانادا وە دەڵێت هەتا ناوی نەبەن بە ئەسکندەر جێگای لە هیچ شوێنێك نابێتەوە.

## مرۆڤایەتی لە شیعری شاعیری میللیمان جگەر خوێنی نەمردا

لە پەنجاکاندا بابەتی مرۆڤایەتی لە ئەدەبی کوردیدا سەری هەڵدا، ئەم بیرە تازەیەش کە لە پشتگیری کردن و هەست دەربڕینی شاعیران و نووسەرانەوە خۆی دەنوێنێ بەمەبەست و ئامانجی یەکگرتنی هەموو گەلانی چەوساوەی جیهانە دژ بە ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانی کە دوژمنی سەرەکی مرۆڤن. لە دوای جەنگی دووەمی جیهان بە ڕووخانی ئەڵمانیای هیتلەری.

بزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین گورزی کوشندەی وەشاند لە ئیمپریالیزم و نۆکەرانی کە خۆی لە پەیوەندی دەرەبەگایەتی و رژێمە کۆنەپەرست و برجوای کۆمپرادۆر و بیرۆکراتەکاندا دەنوێنێ و دەست کەوتی مەزنی بەدەست هێناوە بۆ جەماوەری گەل.

سەرکەوتنی شۆڕشی چین لە ١٩٤٩داو سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا لە ١٩٥٣ و سەرکەوتنی گەلی میسر لە شەڕی کەنداوی سوێس لە ١٩٥٦ و رزگار بوونی گەلی جەزائیر لە ١٩٦٢ و سەرکەوتنی گەلانی ڤێتنام و کەمبۆدیا و لاووس دژی داگیرکەری ئەمریکای لە ١٩٧٥دا. ئەم سەرکەوتنانە بوونە هەوێن و سەر مەشق بۆ گەلانی ترو لە ئەدەبیاتی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا ڕەنگیان دایەوە، شاعیر و نووسەرانی کوردیش کە هەڵگری بیری پێشکەوتنخواز بوون و ئاگاداری ئەم ڕاپەڕین و جموجۆڵە سیاسییانەی گێتی بوون لە شیعرەکانیاندا رەنگی داوەتەوە. کامەران موکری نەمر لە هۆنراوەی جەمیلەدا هەستی گەلی کورد بەرامبەر خەباتکەرانی جەزائیر پێشان دەدات، دڵزار باسی سەرکەوتنە مەزنەکەی

چین دەکات، گۆران لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازاد دەڵێ، موحەمەد حوسێن بەرزنجی گۆرانی بۆ سەرکەوتنی ڤێتنام دەڵێ:-

جگەر خوێنی نەمرمان لە ڕوانگەی تەسکی نەتەوەیی‌یەوە کێشەی گەلەکەی نەخستۆتە ڕوو بەڵکو بەستوویەتیەوە بە کێشەی مرۆڤایەتی لە جیهاندا لە پێناوی نەهێشتنی چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە.

هەر زوو درکی بەوە کردوە کە کێشەی چینایەتی. کێشەیەکی گرنگە و بزوێنەری مێژووە، لەم پێودانگەوە هەنگاوی ناوەو شیعرەکانی بوونەتە پارچەیەك لە ژان و ژواری چەوساوەکان. بە زمانێکی ساکار وسادە کە زمانی پاڵەو جووتکار و کرێکارانی کوردستانە، دەنگی خۆی بەرز دەکاتەوە و پشتگیری کاروانی خەبات و تێکۆشانی هەموو گەلانی ئازادیخوازی دەکات، هەستی کوردی بەرامبەر بەگەلی فەلەستین و ڤێتنام پیشان داوە، گۆرانی بۆ هەڤاڵ رۆبنسن و ئافرەتانی جیهان و میهرەجانی بەرلین ووتوەو، شینی بۆ ستالین و یادی لینینی مەزنی بەشیعر هۆنیوەتەوە، شاعیر بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کوردی بە بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی جیهان بە تایبەتی گەلی فەلەستین دژی ئیمپریالزم، زایۆنیزم و پیلانە چەپەڵەکانیان گرێداوە، گومانی نییە کە پەیوەندی ئاینی و شارستانیەتی هاوبەش لەنێوان هەر دوو گەلدا هەیە، هەر دوو گەلی برا تێدەکۆشن لەپێناوی ئازادی و سەربەستیدا، لەپێناوی رزگاری لە چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و چینایەتیدا، دەربەدەری گەلی فەلەستینی کارێکی گەورەی کردۆتە سەر شاعیر، شاعیر هەستی برایەتی و یەکێتیی بەرامبەر بەگەلی فەلەستینی داگیرکراو دەردەبڕێ، داوا ی

پتەوکردنی خەباتی دوو قۆڵی دەکات دژی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم، لەهۆنراوەی کورد و فەلەستین دا دەڵێ:-

کا عیزەدین کا سەلاحەدین
قارەمان عەرەب، ڤایێ خوەشی رابوو
هێرشە هێرش ل سەر فەلەستین
سەهیۆنێ خوێنخوار ژ بۆ کۆلەدار
ئەڤ وڵات خوەش کر کۆزكو هێلین
میلونەك عەرەب ژ جێ دەرخستن[1].

شاعیرمان ، لەبەر زوڵم و زۆرداری کاربەدەستانی سوریا ساڵی ١٩٧٣ وڵات بەجێ دەهێڵێ و ڕوو دەکاتە لوبنانی ئاگر و شۆڕش بەشداری کارەسات و ڕووداوە خوێناویەکانی دەکات. بەچاوی خۆی دەبینێ کە چۆن ئیمپریالیزمی ئەمریکی و زایۆنیزمی ڕەگەز پەرست وەکو سەگی هاریان لێ هاتووە هەرچی هێز و توانایان هەیە خستوویەتیانە گەڕ بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی نیشتمانی لوبنان و پێشمەرگە قارەمانەکانی زۆر نا مرۆڤانە بۆمبارانی دانیشتوانی شارو گوندەکانی دەکەن، ڕزگاریخوازی ناوچەکەش زۆر ئازایانە ڕاپەڕیون بەگیان و خوێن وەڵامیان دەدەنەوە، ئەوەتا جگەر خوێنی شاعیر هەستی شانازی خۆی بەرامبەر جەنگەکەی (تەل زەعتەر) دەردەبڕێ ئاوات دەخوازێ کە گەلی کوردی قارەمان بێتە هانایان و پشتیوانی خەباتە ڕەواکەیان بکات، لەم ڕووەوە دەڵێ:-

خوەزی هەبوونا مەژی هەزار مێر
کوردێن قارەمان تەڤ ب چەك و زێڕ
بهاتا هاناتە تەڤ وەکی شێر
بژی سەر بلند ئەی گرێ - زاتەر[2]

شاعیر زۆر هۆشیار و زیرەکانە دۆست و دوژمنی گەلی کوردی دەست نیشان کردووە، دەری خستووە کە گەلی کورد و عەرەب و تورك و فارس بران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانی دوژمنی گەلانن، بەهاوکاری و پشتیوانی کورد و عەرەب و تورك و فارس دەتوانین ئازادی و سەربەستی بەدەست بهێنین ئەمەش زۆر راستە گەلی کورد لەلایەن گەلانی عارەب و تورك فارس ناچەوسێتەوە بەڵکو لەلایەن حکومەتە داگیرکەرەکانی ئەو گەلانەوە دەچەوسێتەوە، دیارە ئەم بۆچوونە پێشکەوتووانە خزمەتی گەورە بەکێشەی رەوای گەلەکەمان دەگەیێنێ پێچەوانەوەی ئەم بیرەش کە بیری تەسکی نەتەوەیی‌یە چەند رۆناکبیرێکی هۆش بچووکی سەر لێشێواو هەڵیان گرتووە ئەمەش خۆی لەخۆیدا خزمەتی کۆنەپەرست و داگیرکەرانی کوردستانی پێ دەکەن و دووبەرەکی و ناکۆکی دەخەنە نێوگەلانەوە، شاعیر لەم ڕووەوە دەڵێ:-

کوردو عەجەم بران دوژمن تەنێ کۆلەدار

ترك و عەرەب هەڤاڵن دژمن سەعید و بایار[٢]

پتر لە بیست ساڵ گەلی ڤێتنام خەبات و تێکۆشانی کرد لە دژی ئەو هێزە ئیمپریالیستی‌یانە کە لەچەند سوچێکی گێتی یەوە هێرشی نارەوایان هێنابووە سەری بەمەبەستی تالآن کردن و دابەش کردنی خێر و بێری وولاتەکەی، لە ئەنجامی خەباتی سەختی گەلی ڤێتنام سەرکەوتنی وەدەست هێناو توانی گەورەترین هێزی ئیمپریالیزمی جیهانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی تێك و پێك بشکێنێ و ئەو ئەمریکا زەبەللاحە چۆکی دادا بەرامبەر بە گەلی ڤێتنام لێرەدا قسە بە نرخەکەی لینین مان دێنێتەوە یاد کە دەڵێ:- ((هەموو کۆنەپەرستەکان پلنگن لە مقەبا دروست کراون بە دیمەن سامدارن، لە راستیا هێزیان زۆر

گەورە نىیە، ئەگەر بە ووردی سەرنج بدرێ ئەزانرێ، کەهێز و توانای گەورە لە میللەتایە نە لە کۆنەپەرستەکانا)).

سەلماندی کە هیچ هێزێك نىیە لەجیهان دا بتوانێ سەربە گەلێك دابنەوێنێ کەلەپێناوی رزگاری و ئاشتیدا بجەنگێ ئیمڕۆکە لە کوردستانی گەورەماندا داگیرکەران شەڕی لەناوبردنی گەلی کوردیان بەرپا کردووە، بەلاّم رۆژ بە رۆژ ئاگری شۆڕش بە جۆش تر دەبێ و ورەی خەلّکی کوردستانیش تا دێت بەهێز و پتەوتر دەبێت بەسەرکەوتن و نەمانی داگیرکەرانی لەم رووەوە بیری پێشکەوتوو فێرمان دەکات کەهەموو کۆنەپەرستەکان خەریکی ئەوەن کە شۆڕشەکان بە کوشتنی بەکۆمەڵ لەناو بەرن، بڕوایان وایە کەهەر چەندە خەلّکێکی زۆرتریان سەربڕی باشتر جەزرەبە لە شۆڕش دەدەن، بەلاّم راستی پێچەوانەی ئەم جۆرە بیر و بڕوایەیە کە کۆنەپەرستی حەزی لێ دەکات راستی دەڵێ:-

هەر چەندە کۆنەپەرستەکان خەلّکێکی زۆر تر سەربڕن هێزی شۆڕش گەورەتر دەبێ، کۆنەپەرستەکان باشتر لەمردن نزیك دەبنەوە، ئەمە یاسایەکی ئەوتۆیە بەربەرەکانی ناکرێت، جەنگە مەردانەکەی ((دیان بیان فوو)) کە لەهەموو دونیا دەنگی دایەوە، جگەر خوێنی شاعیرمان شانازی پێوە دەکات و بە سەنگەری سەرکەوتنی هەموو گەلانی ئازادیخوازی دەزانێ و بۆیە جۆش و خرۆشی تێدەکەوێ و گۆرانی شادی بۆ دیان بیان فوو و سەرۆکە مەزنەکەی ((هۆشی منە)) دەڵێ:-

دیـان بیـان فـوو ، دیـان بیـان فـوو
هـەورێ کـوّلـەدار ژ هـەڤ بـەلا بـوو
ئـەوی هـەورێ کریّت ئەڤ رەش و تاری
زوّرو بـرچـی بـوون تـم ژێ دیـاری
بـایـێ ئـازادی سـەورا ئـوّکتـوّبـەر
دەنگی هوّشی مین، پڕخورت و هینەر[٤]

پوّل روّبنسن (١٨٩٨ - ١٩٧٦) گوّرانی بیّژیّکی قولەرەشی ئەمریکایی بوو، گوّرانی بوّ ئازادی و سەربەستی مروّڤ دەوت گوّرانیەکانی دژی رەگەز پەرستی و چەوساندنەوەی مروّڤ بوو لە لایەن مروّڤەوە، ئیمپریالیزمی ئەمریکی خستیە ناو قەفەسەوە تاکو لە دەنگی دلیّری رزگاری ببیّ، لە هەموو لایەکی دونیاوە دەنگی نارەزایی بەرز بوّوە بوّ ئازادکردنی، ئیمپریالیزمی ئەمریکایان ناچار کرد کە ریّگای پیّ بدا بخویّنیّ.

جگەر خویّنی شاعیرش لە چیا سەرکەشەکانی کوردستانەوە دەنگی پشتگیری خوّی دەگەیەنیّتە پوّلێ روّبنسن و دەلّیّت:-

ئـەی هـەڤالێ روّبنسن، دەنگ بیّژی جیهان
پـاشمیّـری سـەلام، زانـا و ئـینـسـان
گـەڕ نـاس و ریّـنـاس، دژمنـێ دالاس
دسـەر ئـافـادا، دسـەر چیـارا
دەنگێ تەیە خوەش ، خوّش تێ گوهێ مە[٥]

سـالّی ١٩٥١ لەشـاری بـەرلین دا میهرەجـانی سـێیەمی لاوان و قوتابیـانی جیهـان بەسـترا، لـەپیّناوی وەدی هیّنـانی ئـازادی و ئاشـتی و یـەکیّتی و هاوکـاری لاوان لـە سەرانسـەری جیهانـدا، شـاعیر شـادی خـوّی

بەرامبەر بەم ڕووداوە گرنگە دەردەبڕێ و بەناوی((مەهرەجانا بەرلینی)) دەڵێ:-

هەڕن مەهرەجان ، مەهرەجانا خوەش
دەستێ هەڤ بگرن، جوان و کەلەش
هیندیی و چینی ، عەرەب و حەبەش
هەمێ ببن یەك ، چ گەورو چ رەش
هەی کەچێن جوان، وەی خورتێن جوان
خێرخوازێن جیهان، هەڕن مەهرەجان[٦]

هەموو ساڵێك لە هەشتی ئازاردا ئافرەتانی جیهان بەبێ جیاوازی رەگەز و جنس و نەتەوە یادی ئەم جەژنە پیرۆزە دەکەنەوە، لە وڵاتە ئیشتراکیەکاندا شێوەیەکی رەسمی وەرگرتووە. میری بەشداری ئاهەنگ و کۆبوونەوەکانی دەکات، لەوڵاتە سەرمایەدارەکاندا، هەر چەندە بە ڕواڵەت ڕێگای بە یەکسانی ئافرەت دراوە، لەگەڵ ئەویشدا موڵکایەتی تایبەتی گەلێ تەنگوچەڵەمە دەیەنێتە ڕێگای ژیانی، وەك نەبوونی یەکسانی لەکارکردندا، لەلایەکی ترەوە بێ ئیشی کەپاڵی بەزۆر ئافرەتەوە ناوە کە خۆیان بفرۆشن لە گێتی سێیەم ئافرەتان لەدوو سەرەوە دەچەوسێندرێنەوە لەلایەك لەلایەن ڕژێمی کۆنەپەرستەوە لەلایەکی ترەوە لەلایەن رژێمی کۆمەڵایەتی‌یەوە. جگەر خوێنی شاعیریش بەناو نیشانی ((هەشتی ئاداری)) هەستی خۆی دەربڕیوە:-

هەشتێ ئاداری رۆژا مەهلات
جەژنا ژنایە ژینێن دیموکرات
ڤێ رۆژا پر خوەش رۆژا دلشادی
رۆژا سەربەستی گەردن ئازادی [٧]

سەرچاوەکان

١. دیوانی کێمە ئەز، جگەر خوێن ١٩٧٣ ، ل١١٢.

٢. دیوانا شەفاق ، ستوکهوڵم ، ل٣٣.

٣. دیوانا سەورا ئازادی ، ستوکهوڵم ، ل٦٤.

٤. دیوانا سەورا ئازادی ، ستوکهوڵم ، ل٨٨.

٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٨٢.

٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦.

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧.

* * *

## میرزا لافاو ۱۸۸۷ – ۱۹۵۲

هەروەکو ئاشکرایە لەبەر چەندین هۆ تاوەکو ئێستا نەتوانراوە بە تەواوەتی لەسەر هەموو شاعیرە کلاسیکیەکانی کورد بنوسرێ و بەرهەمەکانیان بە ڕێکوپێکی چاپ بکرێ و لەمەترسی فەوتان ولەبیر چوونەوە رزگاریان بکرێت، جامن لە ئاستی هەست کردن بەبەر پرسیاری وبەپێی توانای خۆم وئەو شتانەی دەستم کەوتووە وا باسی شاعیرێکی کورد دەکەم کە وا بزانم تاوەکو ئێستا شتێکی وای لەسەر نەنووسراوە.

ئەو شاعیرەی باس دەکەین، نازناوی شیعری (لافاوە) ولە شاری قەڵادزێ دا بە میرزا ئەحمەد موختار ناوبانگی دەرکردووە. لافاو لە ساڵی ۱۸۸۷ی زانینی لە دێی ئەشکان لە ناوچەی ئالانی کوردستان رۆژهەڵات (ئێران) لە دایك بووە، باوکی ناوی محەمەد بووە، هەر لە منداڵیەوە لافاو نراوەتە بەر خوێندن وبەپێی ئەو سەردەمە خوێندن بە زمانی فارس بووە، ئەویش لە شاری سەردەشت وچەند ناوچەیەکی تردا خوێندویەتی. لافاو هەر لە گەنجایەتیەوە حەزی لە شیعردانان کردووە وتواناو بەهرەیەکی باشی هەبووە، پاش ماوەیەك کوردستانی رۆژهەڵاتیان بەجێهێشتووە ماڵیان باری کردووە بۆ کوردستانی باشوور (عیراق) لەشاری قەڵادزی دا بەیەکجاری جێگیربوون وە لەوێ لەبەرزیرەکی وبلیمەتی یەکسەر کردویانە بە موختاری شاری قەڵادزی، لافاو زۆر دژی نەخوێندەواری بووە، چەندەها جار داوای یارمەتی لە خەڵکی قەڵادزی کردوە کە یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی قوتابخانەیەك بکاتەوەو خەڵکی تیادا فێری خوێندەواری بکات، بەڵام یارمەتی یان نەداوە هاوکاریان نەکردووە، جا ناچار بووە کە خانوەکەی خۆی چۆڵ

بکات وبیکات بە قوتابخانە وخۆی لە خانوی کرێدا دابنیشێ، لافاو لە قوتابخانەکەیدا دەرسی بە گەورە ومناڵ وتومو فێری خوێندن ونوسینی کردوون بەزمانی فارسی وعەرەبی، سەرەڕای ئەوەش خۆی لەسەرتاپای ژیانیدا هیچ مامۆستایەك دەرسی ئینگلیزی پێ نەوتوە بەلام بە زیرەکیو بلیمەتی خۆی، توانیویەتی ئەو زمانە فێر ببێ وقوتابیەکانیش فێرکات، میرزا لافاو جگە لە شیعر شتی تریشی نوسیوە، بەلام لەبەر ئەوەی هۆنراوەکانی دژی ژێر دەستی بوون وهانی چینی چەوساوەی داوە بۆ ڕاپەرین پاش نەمانی خۆی هەمووی لەناو براون، ئەم ئەستێرە پڕشنگدارە لەساڵی ١٩٥٢ی زانینی دا هەر لەشاری قەلادزی کۆچی داویی کردووە لە گورستانی ئەوێدا نێژراوە.

ئەمەش چەند نموونەیەکە لەهۆنراوەکانی:-

کوانی نۆبەی کورد هێشتا زۆر لە مێژە بێ دەسە
دەستە پاچەی ڕێی ژیانە تازە ئێش ونەوڕەسە
دا نەبینێ داو نەبینێ داو پسێنێتان وپۆ
لێك نەناسی دۆست ودوژمن چاو لەقاپی نیعمەتە
تۆپ وتەیارە ودەبابە وسنعەتی نۆتۆمی کورد
بۆتە هەولی توتنەوانی وچاو لە قاپی محنەتە

* * *

بێ ئێشی نێشی مێشی هەنگوینی ئیتیحادی
هەنگوین بەشانە زەحمەتە ببرێ لەسەر مرادی
بێ وەعدە بای پەلەك ڕەش بەفری وجودی بەدخود
ڕەش بوونەوەی موشکیلە سنوری دەشت ووادی
بەهار نەیکاتە گرمە باران بەخوڕ نا باری

ڕێواس وکارگی کوێستان ببڕێ لە سەرمرادی

★ ★ ★

لە کۆ کۆ کوو وەکو کۆ کۆ کە واکب کەوکەبی کەونە
لەکانی کانی ماکانی مەکانی کانی ئەنوارە

★ ★ ★

لافاوی میللەت بەگوڕ هەڵستێ
لە کەندو کۆسپە هەرگیز ناوەستێ
ناگەڕێتەوە بەدەست ومستێ
کێ بێ بتوانێ ڕێ ی پێ ببەستێ

## فایقی شاعیر

کۆیە یەکێکە لەشارە کۆنەکانی کوردستان پێش هاتنی ئیسلام ئەم شارە بوونی هەبووە، پێ دەچێ خەڵکەکەشی ئاایینی زەردەشتیان پەرستووە، چونکە کە لەشکری ئیسلام گەیشتۆتە کۆیە شەڕو پێکدادان لەنێوانیاندا ڕووی داوە، (سەلکی کافران و ئەصحابانیش)(١) باشترین بەلگەن.

بەلام لە دواییدا وازیان لەئایینی خۆیان هێناوەو چوونەتە سەر ئاینی ئیسلام و دەستیان کردووە بەدروست کردنی مزگەوت و تەکیەو خانەقا. کۆنترین مزگەوت لەم شارەدا مێژووەکەی بۆسەدەی هەڤدەهەم دەگەڕێتەوە هەروەکو ئاشکرایە لای هەمووان کەزیاتر لەدوو سەدە شاری کۆیە مەڵبەندی ڕۆشنبیری بووە، تیشك و ڕۆناکی بۆ شارەکانی تری کوردستان هاویشتووە، گەلێ زانا و ئەدیب و هونەرمەندو سیاسەتمەداری بەناوبانگی پەروەردە کردووە، لەشارەکانی تری کوردستانەوە بەدەیان شاعیر و مەلا ڕوویان کردۆتە شاری کۆیە بۆ خوێندن و خۆپێگەیاندن و دیدەنی و گۆڕینەوەی زانستو زانیاری وەکو نالی، شێخ رەزا، کەیفی، عاصی، فایەق، کانی، جاهید، صافی...هتد.

لەسەدەی بیستەمەوە بەهۆی باری نالەباری ئابووری و سیاسییەوە، ڕۆشنبیرانی ناچار کردووە، کەکۆیە بەجێبهێڵن و بەرەو شارەکانی تری کوردستان بچن. لەگەڵ ئەوەشدا لەکاروانی ڕۆشنبیریدا دوانەکەوتوون بەلکو هەردەم لەڕیزی پێشەوەن چ لەبواری شیعرەوە بێ یاخود لەبواری رەخنەو لێکۆڵینەوە بێ، یان لەبواری پەروەردەو هزرو سیاسەتەوەبێ.

یەکێکە لەو شاعیرانەی کەهاتووتە شاری حاجی قادری کۆیی، نازناوی فایقە، هەروەها بەنازناوی (حەزین)یش ناسراوە، مامۆستا

عەلائەدین سوجادی دەڵێ:- حەزین ساڵی ١٨٠٥ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٨٨٩ کۆچی دوایی کردووە، ((ناوی مەلا وەسمان و کوڕی مەلا ئەحمەدی مەلا فازڵی مەلا حوسێنی مەلا میرەیە. بنچەکەیان لە وڵاتی هەمەدانەوە هاتووە، مەلا وەسمان خۆی لەگەڕەکی دەرگەزێنی شاری سولەیمانی هاتۆتە دونیاوە، هەر لەوێش مردووەو لەو خانەقایەش کەبە خانەقای حاجی مەلا عەلی بەناوبانگە نێژراوە، حاجی مەلا عەلیش کوڕی مەلا وەسمانە حاجی وەسمان خەلیفەی شێخی سراج الدین بووە))(٢). د. مارف خەزنەداریش لەبارەی شاعیرەوە دەڵێ:-

((مەلا عوسمان عیمادەدین کوڕی حاجی سمایلە خەڵکی سلێمانی‌یەو تەخەڵوسی (فایەق)ەو لە ساڵی ١٨٢٤ لەدایك بووە و لە ساڵی ١٨٨٩ کۆچی دوایی کردووە))(٣).

د. ئەمین موتابچی بەشێك لەشیعرەکانی فایقی کۆکردۆتەوە و دەڵێ: ((وەسمان ساڵی ١٢١١ك لەسلێمانی لەدایك بووە و ساڵی ١٣٠٧ی کۆچیش هەر لەسلێمانی مردووە))(٤).

کارەکەی د. موتابچی بریتی‌یە لە (٤٣) غەزەل و یەك قەسیدەو دوو تەخمیس و دوو چوارین و چوار تاك و مەتەڵێك، د. موتابچی شیعرەکانی لە ڕووی لێکدانەوەی ووشەوە ڕافەکردووە، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ زمانی عەرەبی‌و فارسی خستۆتە ڕوو، دیارە بەپێی ئەو ساڵەی کەموتابچی دەستنیشانی کردووە کە ١٢١١کۆچی بۆ ساڵی لەدایك بوونی شاعیری داناوە کەدەکاتە ساڵی ١٧٩٧ی زاینی‌و لەگەڵ ڕاکەی د. مارف خەزنەدار و عەلائەدین سوجادی ناگونجێ دیارە بۆ ساڵی کۆچی دوایی شاعیر د. ئەمین ساڵی ١٣٠٧ داناوە کە دەکاتە (١٨٨٩) لەگەڵ ڕاکەی د. مارف و سجادی دەگونجێ.

بەهەرحاڵ لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە ژیاوە، شاعیر خوێندنی لەحوجرەی مزگەوت تەواو کردووە، بۆ خوێندن زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە، بۆ ئەمەش سەری لەکۆیە داوە، چوەتە دیوەخانی ئەمین ئاغای (ئەختەر)ی شاعیر و هاودەمی نالی و کەیفی و حاجی شاعیر بووە هەر ئەم سەردانەشی بۆتە هۆی ئەوەی کەبەشێکی شیعرەکانی لەشاری کۆیە بەجێ بهێڵێ.

شیعرەکانی فایەق بەگشتی لە ڕووی ناوەرۆکەوە دڵدارین وەکو شاعیرە کلاسیکیەکان کۆمەڵێ غەزەل و قەسیدەی ئەوین و عیشقی پڕ سۆزاوی هۆنیوەتەوە، کەپەیڕەوی قوتابخانەی شیعری نالی و سالم و کوردی کردووە، شاعیر لە غەزەل و قەسیدەکانیدا ووشەیەکی زۆری عەرەبی و فارسی بەکاربردووە، کەبۆ کاتی خۆی شتێکی ئاسایی بووە، چونکە ڕۆشنبیریەکەیان رۆشنبیری مزگەوت بووە، لە مزگەوتیش بوستان و گوڵستان و کتێبی تر بەزمانی فارسی خوێندراوە، جگە لە قورئان و ووتەکانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ بەزمانی عەرەبی بوونە، بۆیە کاریگەری زمانی فارسی و عارەبی بە بەرهەمی شاعیرانی کلاسیکیەوە بەزەقی بەدەردەکەوێ ، لە رووی رووخسارەوە شیعرەکان بەزۆری سەر بەکێشی یانزە برگەیی و پانزە برگەین، یەکێتی سەروایان بە خۆوە گرتووە، لە کۆتایی هەر شیعرێکدا. نازناوی (فایق) دووبارە بۆتەوە، ئەوەی لەهەمووان زیاتر سەرەنج ڕادەکێشێ، شاعیر لە شیعرەکانیدا لەجیاتی (ئە)، (دە)ی بەکارهێناوە کە بەپێچەوانەی شاعیرانی سلێمانی مامەڵەی کردووە، وەکو بەدەردەکەوێ کاریگەری شاعیرانی کۆیەی بەسەرەوەیە.

جا لێرەدا بەچاکی دەزانین کەهەندێ لەشیعرەکانی شاعیر بخەینە بەر دیدی خوێنەران بۆ زیاتر ناسینی شاعیر، نابێ ئەوەشی لەیاد بکەین

کەکاتی خۆی کورتەیەکی ژیانی شاعیر و غەزەلێك و قەسیدەیەکی بەناوی (بەخاتر خاڵی زوڵفت ریشەیی دڵ)و (زەردەی شمشێری ئەبرۆتن)م، بڵاوکردونەتەوە، لەپێشەوە بەقەسیدەکانی دەست پێ دەکەین.

بۆ شەمعی جەماڵت دڵی پەروانە میسالم
سەربازە بە میقرازی غەمت خێڵی خەیالم
موسا رەوشم بۆ تەڵەبی دیدەنی دڵدار
بەختم سیاهو طوری سیفەت کۆی زوخالم
بۆ کەشفی حیجاب شەوی زوڵفت لەمحەی رووت
هەم رازی صەباو هەم نەفس و بادی شەمالم
تا قامەتی سەرووت هەوەسی طرفی چەمەن کا
سونبول قەددم لالەو دڵ خرافە غەراڵم
عەیب و هونەری مەی لەمنی مەست دەپرسی
زاهید بەدزی موحتەسەبو شەحنەیە زالم
یەك جورعە لەصەهبایی موحبەت نەچەشتی تا
حاڵی نییە یەك زەرە بەصەد جەولە حالم
نازیرەکە مورغی دڵی عاشق لەخەتی دۆست
سەودا زەدەی زوڵف و روخ و دانەی خاڵم
شۆرو شەرەری عەشقە لە شیشەی مەیە فلفل
وەك کەبکی دەری دێ لەدەرێ مەی کەدەنالم
خاڵی نییە (فایق) لە شەکر رێزی کەلامی
توتی حەرەم و ماهو روخ و میهری جەمالم

* * *

شەهیدی شەهدی لێوی ئاڵی تۆ بووم
ئەسیری داوی زوڵف و خاڵی تۆ بووم
لە قەندابی دەهانت بوو حەیاتم
قەتلی چاوی مەست و کاڵی تۆ بووم
وەکو یوسف لەجاهی غەبغەبت دا
زولیخای کانی درو لاڵی تۆ بووم
سەراسەر خوێن بوو مەغزو گۆشت و پۆستم
حەنایی پەنجەیی شەمشاڵی تۆ بووم
وەکو نێرگس نەبینا بووم لە رووت دا
وەکو گوڵ فەرشی پێ و خرخاری تۆ بووم
زەمانی تەزرە بارانی هەم غەم
خەواڵوی خێوەتی شاباڵی تۆ بووم
وەکو خاك بووم لە ڕێی مەیخانە ساکین
شەو رۆژ دایمە پاماڵی تۆ بووم
رەقیب وەك بادی صەرصەر هاتوودای لێم
پەرێشان غافیلی ئەحواڵی تۆ بووم
شوکر (فایق) بە طوری سینا
لە سۆزی سینە کۆی زوخاڵی تۆ بووم

* * *

ئێستاش چەند غەزەلێکی دەخەینە ڕوو:
دەروون غەرقایی خون و لەلا ڕەنگم
بەشێوەی چەشەی تۆ مەست و دەبەنگم
شەرابی نابی عەشقی تۆیە روحم
بە ئەفسوردەی هەوای تریاکو بەندم

ئەرێ کافر بەچەی تەرسە تەبیعەت
بەسیە ئەزیەت ئی دی بۆ من فەڕمنگم
عەروزی قافیە و تەقطیعی سەجعم
کەوا لەنگە لە حیرمت دا دەلەنگم
گوتم سۆفی پەرێشانم لە طاعەت
گوتی وەڵلا لەو شوکر سەربەسەنگم
شەکەر رێزن قسەم وەك شەهدی فایق
خصوصی بۆ محبوبەی چەلەنگم

★ ★ ★

بەداخی لالە روویان دڵ گرفتار
بەقەیدی زوڵفی جاویدان گوفتار
شەهدی نێرگسی فەتتانی سەرمەست
بەعیشوەو غەمزە و شەنگی قەدی یار
نیازی من لەدونیا و قیامەت دا
کەلامی بولبول لەعلی شەکەر بار
بەحەمەدوڵلا بە مقصودم گەیشتم
نەجاتم بوو لە حوزن و غەم بەیەکبار
مەتاع ئەز جانی من بێ مشتری عەشق
بەسێ درهەم وەکو یوسف لە بازاڕ
گەر رووخسارەکەت جارجار ببینم
غولامی کودام قاپی دەزانم شاهو خونکار
زەمانە هەڵقە گۆشی نەزمی فایق
دیارە گۆشەدارە دەردی شاسوار

## پەراوێز و سەرچاوەکان

١. خەڵکی شاری کۆیە لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکان بەشەڕ هاتوون و بەرگریان لە ئاینی خۆیان کردووە، پاش ئەوەی بوونەتە موسڵمان، بە بەرهەڵستکارەکانیان ووتوە کافر، سەلکی کافریش، دیارە لاشەی یەك لەو بەرهەڵستکارە کوردانەی خەڵکی شاری کۆیە بووە.

ئەصحابەکانیش عەرەبە موسڵمانەکان بوونە کە لەگەڵ خەڵکی دەوروبەری کۆیە بە شەڕ هاتوون لە ئەنجامدا کوژراون، جا خەڵکی بە عەرەبە موسڵمانەکانیان ووتوە ئەصحابەو لاشەکانیشیان لەلای ئەصحابان نێژراون.

٢. عەلائەدین سوجادی:- مێژووی ئەدەبی کوردی. چاپخانەی معارف، بغداد ، ١٩٧١،ل٦٠٢.

٣. گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە ٧، ساڵی ١٩٧٣.

٤. د. ئەمین موتابچی دیوانی مەلا وەسمان، بەغدا، ١٩٧٣.

٥. پاشکۆی رۆژنامەی عیراق بە زمانی کوردی، ژمارە، ٢. بەغداد، ١٩٧٧.

٦. شیعرەکان لە ئەرشیفی بەندە وەرگیراون.

★ ★ ★

## (دۆزینەوەی دەسنووسی (فایق)ی شاعیر)

ئەگەر ئێمە بەدوای کۆکردنەوەو بوژاندنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتیمان وێڵ نەبین و شاعیر و نووسەر و هونەرمەندانمان بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ئاشنا نەکەین و وەکو پێویستیش نرخ و پلەوپایەیان بۆ خەڵکی روون نەکەینەوەو بەچاوێکی پڕ لەڕێزەوە نەڕوانینە شیعرو شاعیرانی پێشوو بەرهەمە بەنرخەکانیان نەخەینە سەر لاپەڕەی گۆڤار و رۆژنامەکانمان بێ گومان رۆژگاری چەپەڵ و نالەبار بێ نازو وبێ قەدریان دەکات و دەکەونە گۆشەی لەیاد کردن و تەپوتۆزی زەمانەش بزرو گومیان دەکات و وەکو ئاڵتوونی نێو لیتە دەمێننەوە، ئەمەش لە ئەنجامی هەڵوێستی ناراست و دروستەوە سەرهەڵ دەدا، ئەگینا پارێزگاری کردنی سامانی نەتەوایەتی‌مان و زیندو کردنەوەی بەرهەمی کلاسیکی کوردی‌مان لەنرخی ئەدەبەکەمان کەم ناکاتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەردێ دەخاتە سەر بناغەی ئەدەبەکەمان و بڵندترو بەپێزتری دەکات و دەبێتە موڵکی گەل ومایەی شانازی پێوە کردن، لەڕوانگەی ئەم تێ ڕوانینەوە دەمەوێ بەخوێنەرانی ئازیز ڕابگەیەنم کە دەسنووسێکی (فایق)ی شاعیرم لەلای بنەماڵەی ئەختەری شاعیر دۆزیوەتەوە کە پشتاوپشت بۆ رۆستەمی شاعیر بەجێماوە، جا منیش بەئەرکی سەرشانم زانی کە هیچ نەبێ جارێ ئەم شاعیرە وون بووە، بەخەڵکی بناسێنم و هەندێ نموونەی هۆنراوەکانی بخەمە ڕوو بەئاواتی ئەوەی بتوانم بیکەم بە نامیلکەیەکی، بچووك و لاپەڕەی جوان و زێڕینی ئەدەبەکەمانی پێ برازێنمەوە.

دەسنووسەکە لە پەنجا قەسیدەی هەمەڕەنگی دڵداری پێك دێ، کە بەشێوەی کلاسیکی نووسراوەتەوە زیاتر لەدوای هەموو قەسیدەیەکدا

نازناوی (فایق)ی بەکارهێناوە. شاعیر (ناوی مەلا عوسمان عیمادەددین کوڕی حاجی سمایلە خەڵکی سلێمانییەو تەخەڵوسی (فایق)ە، لەساڵی ١٨٢٤ لەدایك بووەو لە ساڵی ١٨٨٩دا کۆچی دوایی کردووە <<١

شاعیر خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت تەواو کردووە، زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە، بۆ خوێندن سەری لەکۆیە داوە، چووەتە دیوەخانی (ئەختەری) شاعیر و هاودەمی نالی و حاجی و کەیفی بووە، هەر ئەم سەر لێدانەشی بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەم دەستنووسە شیعرەی خۆی بەجێ بهێڵێ‌و ئەمەش قەسیدەیەکی شاعیرە:-

زەدەی شمشێری ئەبرۆتن صەفی ڕۆم و عەجەم جانا
غولامی خاڵی هێند ووتن گیوو دارا و جەم جانا
بە قامەت سەروی ڕەعنایی بە قیمەت دوڕی یەك تایی
خەجاڵەت یاری رووخسارت گوڵ و باغی ئیرەم جانا
ئەسیری زوڵفی چین چینت غولامی خاڵی موشکینت
حەبەش تا چین و بەنگاڵە هەموو خێل و عەشەم جانا
بەچاوم سوێند دەدەی هەی هەی نەکەی نۆشی پیاڵەی مەی
شەراب نۆشم بەچاوی تۆ لە ئەوقاتی قەسەم جانا
ئەگەر یەك دەم عیبادەت کەی دڵی بێ چاری غەمخوارم
دەکەم ئیحیای صەد عیسا لە ئانێك نیمە دەم جانا
نەسیم زوڵفت دەکا شانە لە شەمعی ڕووتە پەروانە
دەڵێی هەر شێتە فەرزانە لە وەختی سوبحدەم جانا
بە شوعلەی ئاتەشی هیجران چراغی بەزمی عوششاقم
خەیاڵت دێت و دەر فێنێ سوپاهی خێڵی غەم جانا
پیاڵەی بادەیی وەصڵی سواری مەرکەبەی هیجران

مـەسـافـەت طـەی دەکـەم دایـم لـە قـوربت کـەم دەکـەم جانا
بـەیادی قـەددی دڵ جووتـە لـەسـەر خـاڵـی سـەری گـۆنـە
ویـصـالـی رووتـە بـۆ (فـایـق) خـەیـاڵـی پێشووکـەم جـانـا
ئەمەش هۆنـراوەیـەکی تـرە:

بـەخـاتـر خـاڵـی زوڵـفـت ریـشـەیـی دل
دەسـا مـەشـکێـنـە تـوخـوا شـیـشـەیـی دل
سـەفـەر کـردن بـەرِێی هـات و نـەهـات دا
چ خـۆشـە گـەر غـەمـت بێ نـۆشـەیـی دل
نـەفـەرهـاد و نـەشـاپـوور و نـەخـوسـرەو
غـەنیمـی بێ سـتـوون بـۆ شـوشـەیـی دل
ئەگەر خونچەی ئەجەل زووم لێ دەپشكوێ
دەکـەم جـەمعـی یـەکـا یـەك خۆشەیی دل
لـە قـافـی عـەشـقـی دا عـەنـقـا میـسـالـم
بـەگـەردابـی مـوحـیـبـەت پـیـشـەیـی دل
گـورفـتـارم بـە زوڵـفـەیـنـت پـەرێـشـان
دەهـانـت واهـیـمـە و ئـەنـدێـشـەیـی دل
مـەدەن طـەعـنـە کـە (فـایـق) مەسـتـە دائم
مـەیـە مـیـراوی بـاغـی پـیـشـەیـی دل

١) لە نووسەری کورد، ژمارە (٧)، ساڵی ١٩٧٤، دکتۆر مارف خەزنەدار ئەم کورتە ژیانەو قەسیدەیەکی بەناوی غەزەل بلاوکردۆتەوە کە هەمان قەسیدە لە دەسنووسە دۆزراوەکەی لای خۆمان هەیە.

## دکتۆر شۆی دڵتەڕو مەعشوق[1] وسەیرانی دەربەندیخان

کات بەهار بوو، سروشت بەرگی سەوزو قەشەنگی پۆشی بوو، کۆلێجی ئادابی سلێمانی سەیرانێکی بۆ هەوارگەی چنارەو توونێلی دەربەندیخان ساز کرد، دکتۆر شۆی خوشەویستیش سەرقافڵەی ئەو گەشتەی پێ سپێردرا بۆ ئەوەی سەیرانەکەمان بەرگێکی شاعیری بەتام وجۆش وبەلەزەت بپۆشێ، بەم جۆرە بەرەو خاك وخۆڵی نالی شای شاعیرانی کورد کەوتینە ڕێ، شنەی شەماڵی سەر لوتکەی چیا سەرکەشەکانی زمناکۆ وهەورامان، کزە بای فێنکی دەشتە ڕەنگینەکەی شارەزوور، تێکەڵ بە سۆزو ئاوازە بەجۆش وخرۆشەکانی قەد پاڵ ودۆڵ وشیوو نزار وچیا هەزار بەهەزارەکانی ئەو ناوچەیە دەبوون، وە لەنجەو شنە شنی هەڵپەرکێی بەکراسی شۆخ وشەنگەکان دەکرد، هاژەی توونێلی دەربەندەکە، دیمەنی ڕازاوەی ئافرەت وسروشت سەرچاوەی لەبن نەهاتووی کامەرانی وبەختەوەری بوون، مووچرك وتەزوویان بە لەشی مرۆڤ دادەهێنا سروش وئیلهامیان بە دل ودەروونی مرۆڤ دەدا، ئەم سیفۆنیە ڕەنگینە، ئەم دیمەن دڵ ڕفێنە خۆشەویستی دەخستە دڵی مرۆڤی ئاسایەوە چ جای شاعیرێکی ناسراوی وەك دکتۆر شۆی خۆش مەشرەب و(طبع ڕوان) و(سریع والشعر .... بەڵی ئەم دیمەنە جوانە دکتۆر شۆی خستە جیهانێکی تایبەتی یەوە، جیهانێك کەلە هەموو قۆڵەکانیەوە دکتۆر شۆیان، وروژاندبوو، شیعر، چیرۆك لەهەست وسینگ

---

(١) کەوتوملنە مەعشوق، لەناونیشانی ئەم نووسینەدا، مەبەستمان تیۆریە نوێ کەی دکتۆر شۆیە کە لەبەرگێکی تری چاپ نەکراوی دیوانێکی دا دەڵێ، ئەبێ لەمەولا بنچینەی دڵداری بگۆڕدرێ و تۆڕ دەوری مەعشوق بگێرێ دەبێ کچ زیاتر ماندو بێ لەم مەسەلەیەدا.

ودەمی یەوە ئەپژان، جا بۆیە لەم بۆنەیەوا بەخامە ڕەنگینەکەی ئەم شیعرە تەڕو سوێر خوێ یەی تۆمار کرد.

بۆسەیرانەکەی لای دەربەندیخان

قوتابی ئاداب دادە ڕوناك خان

بۆ ئەو سەیرانە هاتبوو ڕوناك

ناسك وشیرین ڕوو بێ گەرد و پاك

روناکی ڕوناك دای لەدەشت وەرد

کیژۆڵەی جوان بێچوە کوردی مەرد

جوانیەکەی ڕوناك ناگرێ باسی

دەك بەختەوەر بی کچی عەباسی

ڕوناك روناکیت بێ وێنە دیارە

ناسك ونازداریت لەگشت لا دیارە

لە یەزدانمە ویت بگەیت بە ئاوات

خزمەت گوزار بی بۆ گەل وولاّت

دنیا ڕووناکە بە ڕوناکەوە

گەر ڕوناك نەبێ تاریکەشەوە

بەم شێوەیە ئەم سەیرانە خۆشە بە (کولك وتوك وپێستەوە چووە ناو لاپەڕەکانی مێژوویی ئەدەبی کوردەوە، ئەو ئەدەبەی سەد هەزار قەسیدەکەی دکتۆر شۆی تێدایە کە وەکو هێشوە ترێی ڕەش باغی ئەدەبەکەمانی ڕازاندۆتەوە).

## لەگەڵ شاعیرانی کۆیەدا

لە سییەکان و چلەکاندا شاری کۆیە، جموجۆلێکی سیاسی و ئەدەبی بەهێزو بەتینی بەخۆوە بینی، بەتایبەتی کە جەنگی دووەمی جیهان، بەلەناوچوونی فاشیەت کۆتایی هات و زۆرلێکراوەکانیش لە ژێر زوڵم و زۆرداری سەریان دەرهێناو کەوتنە خەبات و تێکۆشان لە پێناوی مافە ڕەواکانیان لە دیموکراتیو ئازادیدا، خوێندکاران، ژنان، کرێکاران و کاسبکاران، جووتیاران هاتنە کۆڕی خەباتەوە کەوتنە ڕاپەڕین و خۆپیشاندان بۆ ڕوخاندنی پیلان و پەیمانەکانی ئیمپریالیزم و دارو دەستە بەکرێگیراوەکانیان، لە ئەنجامدا گەلێ ڕێکخراو حیزبی نیشتمانپەروەر و چەپ دروست بوون، شاعیرو نووسەرانی کۆیەش بەبیرو کردەوە بەشداری خەڵکی ڕەش و ڕووتیان کردووە لە ڕیزی پێشەوە وەستان و بوونە مەشخەڵ و چرای چەوساوەکان و لەبەرهەمەکانیاندا ڕەنگی دایەوە (خالید دلێر)ی شاعیر، وێژە دەکاتە چەمکی خەباتی کۆمەلانی خەڵك و لەم ڕووەوە دەڵێ:

>>ئەدەب کەلەسەر ڕێبازی زانستییانە هاتبێتە کایەوە پێویستە لەپێش هەموو شتێك دا ناوەرۆکێکی بەپێزو هەتا ئەو رادەیە کەبواری دەدا مەبەستی روون و ئاشکرای هەبێت، ئەوجا گوێ بدرێتە جوانی و نەخشاندنی چوار چێوەکەی و ئەم نەخشاندن و ڕازاندنەوەیەش، دەبێ هەر بۆ ئەوە بێت تا ناوەرۆکەکە باش بنوێنێت<<[1] شاعیر هانی لاوان دەدات کەلە خەوی بێ هۆشی هۆشیار ببنەوەو میللەت لەژێر دەستی و گەساسی رزگار بکەن و قەلای ئیستیعمار بڕوخێنن:_

کورد ئیمڕۆ زۆر هەژارە

دیلی دەستی زۆردارە

مادام لاوی بەکارە

دوژمن دەڕوا ناچارە

حەپس و کۆت و لەداردان

پاش ناخا لاوی کوردان

بەهۆی کۆشش لە مەیدان

دوژمن دەبێ دڵ پارە

هەڵسە کوردە لەخەوێ

ژینی دیلیت قەت نەوێ

بڕمێنە وەك دو دەوێ

قەلای دوژمن لەو شارە

میللەتمان زۆر کەساسە

هەژار و بێ کراسە

لە ژێر بێ گارە کاسە

خەتا لە ئیستیعمارە

شاعیر داوایان لێ دەکات کەیکبگرن و خۆیان بەچەکی زانست چەکدار بکەن بەتایبەتی بەبیری مارکسی - لینینی کە تاکە ڕێگایە بۆسەر فرازیان لە دەرەبەگو داگیرکەراندا، لەم بارەیەوە دەڵێ:-

کوردە ئیستیعمار گەلێ زۆردار و هەم بەدفەڕە

چەشنی گورگی هارە ئیمڕۆ نۆبەچی بزن و مەڕە

بۆ ئەوەی حەق وەرگری چەشنی پڵینگ هەڵمەت بەرە

چونکە ئیستیعمار خەریکی تەفرەقەو زوڵم شەڕە

زدی هەم یەکگرتنە و هەم دەوڵەتی شۆڕشکەرە
کوردە تاکو تێ نەکۆشی بێ شکە ناتبێ نەجات
تێ بکۆشە هەر بزانە دوژمنت ڕای کرد هەڵات
بیری دیموکراتی‌یە دەرمانی دەردی تۆ دەکات
هەر بەعیلم و بیری مارکسی لاوەکانت کەی خەڵات
هەر گەلێکی بێ عیلم بێ بێشکە ئاخر شەڕە
مەیەلە فەرقی بەینی میللەت دەوڵەمەند یا خود هەژار
چینی ڕەنجبەر ڕەنج بدات و کاکی ئەقطاعی لەشار
رادیۆی لێ بکاتەوە و ئارەق بکاتە ژەهرە مار
ڕۆژێ رابوێرێ لە باغ و یان لەناو کۆشك تەلار
خواردنی گۆشتو برنجەو نانو دۆشی هەر بۆ نۆکەرە
ڕۆژی تەنگانە هەژاران دینە مەیدانی هونەر
تێ دەکۆشن بۆ نەجاتیت دەبنە شێر بۆ جەنگ و شەڕ
زوڵم و زۆردار و خائین گشتی دەبنە قوڕبەسەر
لای دلێر وایە کە هۆی ئازادی گەل هەر ڕەنجبەرە
(ئەحمەد دلزار)ی شاعیریش لە پەنجاکاندا کۆمەڵە شیعرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی نووسیون کەلە دیوانە چاپکراوەکانیدا بلاونەکراونەتەوە، خودی خۆشی لە بیرەوەریەکانی ئاماژە بەوە دەکات کە چەند شیعرێکی وون بوونە، لەم ڕووەوە دەڵێ: ((لە ساڵانی ١٩٤٦-١٩٤٩واتا دوای دەرچوونم لە عەسکەری تا ڕۆژی بەند کردنم لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٩دا پتر لە سەدوبیست هەڵبەستی کورت و درێژ و بڕە شیعریم داناوە لە دەفتەری بەرگ مەرمەریدا، جۆرە دەفتەرێك بوو،

کۆم کردنەوە بەڵام دوای گەڕانەوەم لە بەندیخانە لەکۆتایی حوزەیرانی ١٩٥٢ یەکێك لە دەفتەرەکانم چنگ نەکەوتەوەو وون بوو هەر وون))[٢].

لە هۆنراوەی (ژن زانە) دەڵێ: پێویستە ژن هاوسەری خەبات و ژیان بێت، شان بەشانی پیاو بجەنگی لەپێناوی سەربەستی‌دا، جوانی ژن رەوشتە و دەبێ نەوەکانیان ژیرانەو چالاکانە پەروەردە بکەن تاکو لە دوا رۆژدا ئازاو چاونەترس بن.

ژن زانــــە ژەنــگـــی ژیـــانــــە
کـە خـۆی لێـدەی مـاڵـت وێـرانــە
بــرای شیـریـنـم جوانـی خـوڵق و خوو
بەکـاری تـۆدێ نـەك هی رەنگ و ڕوو
ژنــێ پــەسنـد کــەر ڕەوشتـی چـابـێ
چـالاك و خێـــرا ژیـــرو زانـــا بـێ
هـاوڕێی ژیـان و هـاوڕێی بیـرت بێ
لـە بـەنـدیخانە هـاو زنـجیـرت بێ
لـە کـۆبـوونـەوە و هـەڵاو هـەڵچوونـا
لە ڕێی ئازادی و بۆ سەربەستی و نان
هـەر دەم ئـامـادە و شان بە شانت بێ
لـە تـەنگـانـەدا پشـتـیـوانـت بـێ
هـەر وەکـو تـانـیـا و ژانـژکو خانزاد
لـە رۆژی شـۆڕشـا دوژمـن کا بەرباد
چـاوی نـەتـرسێ لـە زەبـر و زلــە
قـەت گـوێ نـەداتـە لـێـدان و گولە
مـنـداڵـی بچـووك زۆر بـاش بـەخێوکا
نـەك بیـتـرسێـنـێ و هـاواری دێوکـا

سەری شەتەك داو دەستی ببەستێ
هەر گریاو مەمکی لەدەم بپەستێ
بەشەو لە بان و عایشێ گوێ درێژ
زراوی بەرێ بیکا گێژ و وێژ

لە هۆنراوەیەکی تری کۆمەلآیەتیدا، بەناوی (سەرخۆشان) رەخنەی توند لەمەی نۆشین و کاری ناپەسند دەگرێت کە هەندێ لە لاوەکان پێوەی خەریکن و لە نیشتمانپەوەری دووری خستونەتەوە.

سەیری سەرخۆشان کەن کە ئێواران بەرەو ماڵ دێنەوە
وەکو سەگی گەڕ لەناو قوڕو چڵپاو دەخولێنەوە
کۆمەڵی بەناو وەتەن پەروەرن
چوست و چالاك و شێرانەو شەڕن
بۆ رۆژی نەبەرد زوبان سوپەرن
خاوەن ئیدراك و هۆش و هونەرن
کەچی ئێربازو مەست و مەی نۆشن
بلح و تەمەڵ و بێ هۆش و گۆشن
وەتەن پەروەریان وەك دار عەسایە
گرتۆتە دەست بۆ دەعیەو هەوایە
ئەگینا بەزەیی یان بەکەس دانایە
خۆ گەر هەزارێ بۆ ئانەیێ نان
دەم پەل کاتەوە لەبەر یەك لەوان
دەڵێ چەند فلست هەیە لە گیرفان
بینە بەشی کەین لە بەینی خۆمان
جا گەر میللەتێ گەنجی ئەوابێ

مــــەزروعـــی هـــۆشـــی هـێـنــده ســــاوابـــێ

خـــوایـــه بـــەشـــی ئـــەو هـــەر نـــەمـــانـــی بـــێ

لـه پەنجاكانـدا شـاعیرانی كۆیـه، تۆفیـق وردی و سـەید ئـەنوەرو ڕۆستەم حەوێزیو دڵزار لە كتێبخانەی كۆیسنجق كۆدەبوونـەوە و باسی ئەدەب و سیاسەتیان دەكرد، لـەم ڕووەوە ئەحمـەد دڵـزار دەڵێ((ڕۆژێكی پـایزی ١٩٤٧ كـاتی چێشـتەنگاو بـوو لـه كتێبخانەكەمانـدا، كتێبخانـەی كۆیسنجق چەند برادەرێك دانیشتبووین كاك ئەنوەریشمان لەگەڵ بوو (ئەوسا كاك ئەنوەر شیوعی بوو) باسی باری ئەوسای وڵاتنمان دەكرد)[٢]

كەوتوونەتە دەمەتەقێی شیعرەوە:-

ووردی ووتی

یەكەم شاعیـرمان ئەحمەد دڵزاره

ڕاستـی حـەقیقەت لای وی دیاره

دڵزار ووتی:-

دووەم شـاعیـرمـان وردی تۆ وردی

بۆ ئازادی بوونمان بـەدەست و بردی

لـەژێـر قـاچی گەل بەمیسلی پردی

هـەر تـۆ شاعیری دوا ڕۆژی كوردی

وردی ووتی:-

سێیەم شاعیرمان ڕۆستەم مەشهوره

شیعری بـەوێنـەی چەشنی چنوره

ڕۆستەم ڕووی له سەید ئەنوەر كرد ووتی:

چـارەم شـاعیـرمان سەید ئەنوەره

شیعری بەمیسل وێنەی گـەوهـەره

سەید ئەنوەر بەرزنجی لە کۆپلەیەکی تردا، بانگی حەقیقەت رادەگەیەنێ و دەڵێ:-

مژدە بێ دەنگی حەقیقەت میللەتان هۆشیار ئەکا
رۆژی ئازادی بەدەرکەوت هێزی دوژمن بار ئەکا
میللەتی مەزڵوم و برسی پڕ بەدەم هاوار ئەکا
رۆژ و شەو نەعلەت لە روحی پیسی ئیستیعمار ئەکا

لە شەستەکاندا (ئەحمەد لاکین) کە موختاری گەڕەکی هەواوان بوو، نامەیەك بۆ (عەزیز سەربەست) دەنێرێ کەلە خەڵەکان دەست بەسەر بوو (سەربەست)یش بەم شیعرە وەڵامی دەداتەوە:

هەڤاڵ ئەحمەد بوێژی دڵسۆز
هەڵگری ئاڵای رزگاری بۆ هۆز
برای خەباتکەر زێڕی ناو بۆتە
بیرت نرخدار زێڕ و زومڕوتە
سوپاس بۆ هەستی بەرزی برایت
بۆ نامەو سڵاو بۆ دڵ نەوایت
وەك رۆژڵات ڕوونە هەتاکو مردن
بەندو بالورە و درۆ و دەلەسە
سپی ڕەش کردن کاری ناکەسە
زێڕی خۆلاسە نابتە تەنەکە
ناکرێ بە پاقر حەکەم مەحەکە
مِن و هەڤالان گەل دەیان ناسن
بڕوابێ هێزن یا پۆلا و ئاسن
هەر ئەو پیلانەی ئێستام نەدیوە
گەلێ درك و داڵ لە ڕێم چەقیوە
کاروانی ڕاستی ئەڕوا لەرێ

ڕێگر لە پێشی سەگ پێی دەوەڕێ
بێ گومان هەرگیز دەگا بە قۆناغ
دڕکی کوردستان دەگۆڕین بە باغ

سەرچاوەکان

١. خالد دلێر، بەرەو لوتکەی ئاوات، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩،ل١٣.
٢. ئەحمەد دڵزار، بیرەوەری ژیانم، ستوکهۆڵم، ١٩٩١،ل٤٤.
٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.
٤. هەردوو شیعرەکەی ئەحمەد دڵزارو خالید دلێرم لەلای خزمانی نزیکم قادر رەشید و عەزیز سەربەست چنگ کەوتوون.

# نەورۆز لە شیعری شاعیرانی کۆیەدا

لەشانامەدا نەورۆز بەمانای رۆژی نوێ و تازە دێت، واتە رۆژێك كە ساڵی نوێ لەوەوە دەست پێ دەكات هەموو گەلە ئارییەكان جەژنی نەورۆز بە جەژنی خۆیان دەزانن و هەر نەتەوە بە شێوەی تایبەتی خۆی یادی ئەم رۆژە پیرۆزە دەكاتەوە. گەلە ئاری نەژادەكانی هندستان و پاكستان و بلوجستان و ئازربایجان و ئەفغانستان و كوردستان نەورۆز بە جەژنی تایبەتمەندی خۆیانی دادەنێن زۆر بەكەیف و شادییەوە ئاهەنگ دەگێرن و بیرەوەری دەكەنەوە، لای ئێمەی كوردیش ئەفسانەی كاوە و زوحاك سیمایەكی تایبەتی وەرگرتووە لەو رۆژەدا كاوەی ئاسنگەر توانیویەتی هەموو چەوساوەكان لەدەوری خۆیدا كۆبكاتەوەو راپەرینێك بەرپا بكات و تەخت و تاراجی زوحاكی زۆردار تێك وپێك بدات. فەرەیدوون نەوەی جەمشید لەجێگای زوحاك خراوەتە سەرتەخت و فەرمانرەوایی وولاتی گرتۆتە ئەستۆ لێرەدا بۆمان دەردەكەوێ كە نەورۆز بۆ فەرمانرەوایی جەمشید دەگەرێتەوە و لەگەڵ دروست بوونی دەوڵەتی پێشدادیدا دامەزراوە، بۆیە گەلی كورد لەهەموو گەلەكانی تر خاوەنی راستەقینەی ئەم جەژنەیە (مامۆستا زەبیحی لای وایە كەماد درێژەی پێشدادین وەكو كوردیش درێژەی مادن بەو پێیە جەمشید بەكورد دادەنێت)[1] پاشان مامۆستا زەبیحی لەسەر ووتارەكەی دەروات و لەسەر قسەی فیردەوسی جەمشید بە پاشای چوارەمی بنەماڵەی پێشدادی دادەنێ و ئەنجامی لێكۆڵینەوەی شوێنەوارەكان وای نیشان دەدا كە یەكەم بنەماڵەی پاشایی مادبوون وە بەم جۆرە پێشدادی و میدیا هەردووكیان دەبنە یەكەم بنەماڵە كە لە قەڵاتی ئێرانا پاشایەتیان كردووە. نەورۆز ئاگر پەرستی نیە بەڵكو ئاگر وەكو نیشانەیەك

بەکارهێنراوە تاکو خەڵکی هۆشیار بکەنەوە و هانیان بدەن بۆ ڕاپەڕین، ئاگر ڕەمزی سەرکەوتنی کاوەی ئاسنگەرە، ڕەمزی سەرفیرازی پێشکەوتن و پەرەسەندنە، لە نەورۆزدا سروشت بەرگی جوان و سەوزایی دەپۆشێ، بەگوڵ و ڕێحان و نێرگز بەهار دەڕازێتەوە، لاو و پیر پۆل پۆل بەجل و بەرگی ڕەنگاو ڕەنگەوە بەرەو شاخ و دۆڵی پڕ مێرگ و مێرخوزاری کوردستان دەڕۆن، دەیکەن بە ئاهەنگ و گۆرانی و هەڵپەڕکێ، نەورۆز شاهیدە کە کورد لەهیچ کات و زەمانێکدا سەری بۆ دوژمنان دانەنواندووە، هەردەم لەسەر وەرگرتنی مافی خۆی سوور بووە، پیرەمێردی شاعیر هەموو ساڵێك لەگردی مامە یارە یادی جەژنی نەورۆزی کردۆتەوە دیارە کەسانێ هەبوونە ئێستاش هەن کەنەورۆز بە ئاگرپەرستی و مەجووسی دادەنێن، پیرەمێرد بەم جۆرە وەلامیان دەداتەوە و دەڵێ:- خوێندەوار دەزانێ ئاگرێ کە خۆی بیکاتەوە و خۆی بتوانێ بیکوژێنێتەوە چۆن ئەیپەرستێ... هەروەکو ئاشکرایە لە پێش ئیسلامیشدا نەورۆز یادی کراوەتەوە.((بەلام نەورۆز لەسەردەمی خولەفاکانی ڕاشدین دا قەدەغە کرا، چونکە دابونەریتی پێش ئیسلام بوو، هەرکەس باسی بکردایە سزا دەدرا، بەم جۆرە ڕۆیشت هەتا ئیمامی عەلی لە مزگەوتی کوفەدا ڕێگای داوە بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە شیرینی بەسەر نوێژکەراندا دابەش بکرێت))(٢)

لەسەردەمی ئەمەویەکاندا نەورۆز زیندووکرایەوە پاش ئەوەی مەعاویە بۆی دەرکەوت کە کردنەوەی نەورۆز هیچ مەترسیێکی نییە و لەهەمان کاتیشدا سوودێکی ئابووری باشی هەیە بۆیە بڕیاریدا کەلە نەورۆز ومیهرەجاندا باج کۆبکرێتەوە. ئا بەم جۆرە یادی نەورۆزی ژیاندەوە.

لەسەردەمی عەباسیەکاندا - دوای نەمانی حوکمی ئەمەوی و هاتنی عەباسیەکان- جەژنی نەورۆز پتر بایەخی پێدرا وەك سەردەمی پێش ئیسلامی لێهاتەوە شاعیران و ئەدیبان کەوتنە نووسین خەلیفەی حەوتەم خۆی لەهەموو کەس زیاتر ئاگاداری بنج و بنەچەی مێژووی پەیدابوونی نەورۆز بوو.(٢)

لەسەردەمی عوسمانیەکانیشدا زۆر بایەخیان بەجەژنی نەورۆز داوە بە پیرۆزیان زانیوە... کەواتە جەژنی ڕەسەنی کوردەو دەبێ یادی بکرێتەوە و بەڕێزەوە سەیری بکرێت و ڕووی ڕاستەقینەی چەواشە نەکرێت. پێویستە لەنەورۆزدا لە هەموو لایەکی کوردستان دەست بەچاندنی نەمام بکەن پێش مادەکانیش ئەم ڕەوشتەیان پەیڕەو کردووە. با لە نەورۆزی ئەمساڵدا کێشەکان یەکلا بکرێنەوەو هەڵبژاردنێکی سەرانسەری دروست بکرێت،، جا شاعیرانی کۆیەش شیعریان لەسەر نەورۆز هۆنیوەتەوەو گرنگی و ڕۆڵی نەورۆزیان بۆ خەڵکی کوردستان ڕوونکردۆتەوە لێرەدا بەشێك لە شیعری شاعیرانی کۆیە دەخەینە پێش چاوان،،،

حاجی قادری کۆیی لە هۆنراوەی (سەد وەکو ڕۆستەم):

سەد وەکو ڕۆستەم بەدڵ قەمچی لەرەخشی دا بەزی
وەك گەیشتە خەندەکی پایانی عومری دابەزی
ڕۆژتە ئەی بادی نەورۆزی لەبن بەفری گران
کانی پێی سڕ بوو. چناریش دەستی چوو. پەنجەی تەزی
سونبولی زولف و گولی ڕوخسارو سەرووی قامەتی
مانگی نیسان و گولان نەیدی لەنێو باغ و ڕەزی

دولبـەرم تـەنهـا کـەبوو لـەو بـەینە خۆی رووت کردەوە

مـن دڵـم خـۆش بـوو کـەچی دووبـارە دایپـۆشی کـەزی... [٤]

(دڵدار) لە هۆنراوەی (گوڵی سوور)دا:

گوڵی سوور. ئەی کچی نەورۆز. ئەرێ کام دەس لەباغی ژین

لـەبـۆ یـەك دەفعـە بـۆن کـردن بـە نـاکامی ئەتۆی هێنا

ئـەوێستاکەش بەژاکاوی

وەهـا بێ قـەدرو تـۆزاوی

لـەسـەر رێگـا فـڕێ ی داوی [٥]

(خادیم) لە هۆنراوەی (نەورۆز)دا.

نـەورۆزە ئیمـڕۆ وەعـدەی شـادی‌یە

جەژنی سەربەستـی و هـەم ئازادی‌یـە

نـەورۆزی پیـرۆز رێکـەوتـەی شـەمە

ئـەم نەوعە جەژنە شـازە زۆر کەمـە

سـروەی نـەسیمـی سـەحەر هاتـەوە

تـا پشـکۆی غونچە گەش بکاتـەوە

موژدەی نەو بـەهار بـدە بـە بولبـول

تاوەکو شادبێ بـە روخسـاری گـوڵ [٦]

(خـالیـد دلێـر) لە هۆنراوەی (س)دا

تـۆ بـەهـار بـووی تۆ نـەورۆز بووی

هـەروەك ئـەوانـیـش پیـرۆزبـووی

وەك مـانگـی یـەك شـەوە وابووی

هـەر پـاش هـەڵاتـن ئـاوابـووی

پێنج. شەش ساڵ . ناسك منداڵ بووی

هـەروەك جـەژنـی سـەری سـاڵ بـووی [٧]

(محەمەد تۆفیق ووردی) لەهۆنراوەی (نەورۆزی ١٩٦٠)دا

نـەورۆز بـە ڕەنگـی سـوورت
بــە ئـاگـر و گــوڵ و نـورت
بـە وێنـەی دووسەد جوورت
بـەو كــاوە قــارەمــانــە
یـاد بكـەیـن هـەموو ساڵ
ژینمان خۆش بێ وە یان تاڵ
دانێـیـن گیـان و سـەر و ماڵ
لـەڕێی ئـەو نیشتمانـە
ئـــازادی خــاكی ڕەنگیـن
بـەخوێنـە نـەك بەئەسرین [٨]

(دلزار) له هۆنراوەی (جەژنی نەورۆزی ١٩٤٩)دا

زەمیـن گـولـزارە
تــازە بـــەهــارە
جـەژنـی نەورۆزە
هـەوا عــەتـرینـە
مێـرغـوزار شینـە
چەشنـــی پیــرۆزە
بەهۆی بای بـەیان
شۆڕایـەی بیبـان
پــەرت و ئـالۆزە [٩].

(عەونی) لە هۆنراوەی (نەورۆزی ساڵی تازە)دا

نەورۆزی ساڵی تازە جەژنی بەهاری ئیمڕۆ
دەنگی بلوێر لەدێیە یان نەی لەشارە ئیمڕۆ
خونچە لە باخی شادی لێوی بە پێکەنینە
بۆیە لەسەر چلانی شینی هۆزارە ئیمڕۆ [10]

(سامی عەودالّ) لەهۆنراوەی (بانگ)دا

کوردە ئیمڕۆ ڕۆژی شادیت موژدەبێ ڕۆژی نەوە
هەستە ئالای شێر نیشانی زەرد و سوورت هەڵکەوە
ئەو زوحاکەی کاوە کوشتی تێپەڕی ئێستا بە خۆت
کۆت و زنجیرێ لەبیرو هۆش و دەست وپێ کەوە
ئەو چرایەی کەیقوبادی زابولیت پێ‌ی کردبوو
جەیشی یۆنانی کوژاندی هەستە زووبە پێ‌ی‌کەوە [11]

ڕۆستەم لەهۆنراوەی (نەورۆزی ١٩٧٢)دا

لەدەست بێگانە هەستانی هەموو خوێشێکی نەورۆزە
بەدەست کەوتی گەلی ژێر دەست لەگشت کێشێکی نەورۆزە
کلیلی دەرك و هەوێنی هەموو شۆڕشێکی نەورۆزە
دوای ڕۆژی رووخانی هەموو عەرشێکی نەورۆزە
نیشانەی دووری ئاواتی هەموو کوردێکی نەورۆزە
کەرەستەی ژیان و دەرمانی هەموو دەردێکی نەورۆزە
کوشندەی گیانی زۆردارو دوا بەندێکی نەورۆزە
قرانی چینی پوڵدارو هەموو پندێکی نەورۆزە [12]

عوسمان (ئاگر) لەهۆنراوەی (نەورۆز)دا:

جەژنی نەتەوەی کوردانە نەورۆزە

نیشانەی مێژووی سەر بەرزی هۆزە

چواردەی گەلاوێژ یادی پیرۆزە

بەیادی رۆژی جەمشید و کاوە

کۆماری عیراق دانی پێ ناوە

ئیمڕۆ یەکەمین رۆژی بەهارە

جەژنی سەری ساڵ یادی دیارە

زستان بڕایەوە و نۆبەتی کارە [١٣]

(ئازاد دلزار) لە هۆنراوەی (شانۆی بەهار)دا:

وا ئەمساڵیش بەهار نەورۆزی کردە پێشەنگ

تا بە ئاگر دەست پێ بکا . سەردتای ئاهەنگ

لەسەر شانۆی ساڵی تازە گلکۆی جوان جوان

هەڵیانداوە پەردەی ڕەشی وەیشومەی زستان

دەرکەوت دنیای مەیبوی ناو ڕەنگ و ڕووناکی

پێچرایەوە شەوی تاری پڕ لە سامناکی [١٤]

## سەرچاوەكان


١. عبدالرحمن زەبیحی >>با تەپوتۆزی سالأن لەنەورۆز بتەكێنین<< رۆژنامەی هاوكاری ژمارە ١٥٩، ١٩٧٣.

٢. حسن محمود حمە كریم . كاوە و نەورۆز، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٤٧.

٣. شوكر مستەفا ، >>نەورۆز لە ئەدەبی گەلاندا<< دەفتەری كوردەواری. ١٩٧٠.

٤. سەردار میران ، شارەزا ، دیوانی حاجی قادری كۆیی. ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری لاوانی ناوچەی كوردستان. ١٩٨٦، ل١٦٤.

٥. عبدالخالق علاوالدین. دلدار شاعیری شۆرشگێری كورد، بغداد، ١٩٨٥، ل١٩٧٠.

٦. جەمال محمدامین، دیوانی خادیم، بغداد، ١٩٨١،ل٣٦٦.

٧. خالد دلێر، بەرەو لوتكەی ئاوات، سلێمانی، ١٩٧٩،ل٥١.

٨. محەمەد تۆفیق ووردی. بانگی كوردستان، بغداد، ١٩٧٠ل٣٢.

٩. ئەحمەد زەردەشت. كاوە و نەورۆز ئەفسانە و بیری نوێ، بغداد١٩٩٩ل٢٤٧.

١٠. دیوانی عەونی ، هەولێر، ١٩٩٧، ل١٦٦.

١١. لە ئەرشیفی نووسەر وەرگیراوە.

١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٣. عوسمان (ئاگر)، پرشنگی چل چیا، بغداد، ١٩٧٢ل٤٣.

١٤. ئازاد دلزار ، خونچەی سەهۆل، بغداد، ١٩٧٥،ل٢٦.

**حاجی قادری کۆیی سەرەتای نوێخوازییە لە شیعری کوردیدا.**

نوێخوازی دیاردەیەکی مێژووییە پەیوەندی بە هیچ کات و سەردەمێکەوە نییە، ئەوەی ئیمڕۆ تازەیە، بەیانی کۆن دەبێت تازەتر شوێنی دەگرێتەوە. نوێخوازی لای حاجی قادری کۆیی داهێنان و تێپەڕاندن و مغامرە کردنە، شاعیری راستەقینە ئەوەیە کە ڕەچەشکێن بێت و شتی نوێ ڕاو بکات، حاجی لە ڕووی ڕووخسار و ناوەرۆکەوە ئاڵوگۆڕی لەشیعری کوردیدا کردووە، دیارە ئاسانی و گرانی پێوانەیەك نییە بۆ شیعر، هەر چەندە حاجی لە هەردوو بابەتەتدا شیعری هەیە، لە ڕووی زمانەوەش رەچەشکێن بووە، ئەگەر چی لە شیعرە کلاسیکیەکانی دا کاریگەری زمانی تورکی و عارەبی و فارسی بەسەرەوەیە، بەلام حاجی وەرچەرخانێکی لە فەرهەنگی شیعری کلاسیکی بەرپاکرد و زمانی شیعری لە قاڵبە ئامادەکراوەکاندا ڕزگار کرد و بنیادی شیعری کلاسیکی تێکو پێکداو فەرهەنگێکی زمانی شیعری ساکار و ئاسانی هێنایە ئاراوە کە نزیك بێت لە زمانی خەڵکی و بەئاسانی لێی تێ بگەن و بچنە ناویەوە.

بەشێکی زۆری شیعرە سیاسیەکانی حاجی لەسەر کێشی دە بڕگەیی جووت سەروا دانراون، کە کێشێکی خۆماڵییە و لەگەڵ خاسیەتی زمانەکەمان دەگونجێ، ئەو شیعرانەی کە بەرکێشی خۆماڵی و سەروای هەمە رەنگ کەوتوون، وەکو ئودەبا چاکە یا ئیلاهی، ئەو ڕۆژە، تارێك نەکەون، شێخ بزەینی، حاکم و میرەکانی کوردستان، خۆ دەزانی سولالەیی ئەکرد، خوسرەو کەیقوباد، شەهسواری بەلاغەتی کوردان، کوردەگی کۆیی...تد،

حاجی پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتۆتەوە، بیرەوانێکی بە توانا و سیاسەتمدارێکی دبلۆماسی بووە، لێ زانانە هەنگاوی ناوە، بەمەش توانیویەتی کە تەقینەوەیەکی فیکری و ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بەرپا بکات، ئەمەش پابەندە لەلایەك بە بزافی رزگاری خوازی کوردستان و لەناوچوونی ئیمارتە کوردییەکانەوە، لەلایەکی ترەوە بە بزافی کوردی و جیهانییەوە، داستان و چیرۆکە ئەفسوناوییەوەکانی سەدەی هەڤدەهەم کە ناوەرۆکێکی سیاسی و شۆڕشگێڕیان هەبوو، وەکو قەڵای دمدم، مەم و زین ئەمانە بوونە هەوێن و سەرمەشق لە شیعرە سیاسیەکانیدا ڕەنگیان داونەتەوە.

بزوتنەوەی رۆشنبیری جیهانی رۆڵێکی مەزنی بینی لە پەرپێدانی ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو زۆربەی ولاتانی ئەوروپادا، بزافی رۆشنبیری بە شێوەیەکی بەرفراوان بریتی بوو لە خەباتێکی فیکری کە چینی ناوەندی پێی هەڵسا دژ بە دەرەبەگ و پاشماوەکانی، بنچینەی ئەم بزوتنەوەیەش لەسەرەتادا لە ئینگلترا سەری هەڵدا، پەرسەندنی پەیوەندی برجوازیلە ئینگلترا زروفێکی لەباری خولقاند بۆ پێشکەوتنی فەلسەفەو زانست و هونەری برجوازی کە بەدرێژایی سەدەی هەژدەهەم ئینگلتەرە بە رۆناکبیری مایەوە، بەم جۆرە فەلسەفەو ئەدەب و زانستی ئینگلترە بەخۆشحاڵیەوە لەهەموو ئەوروپادا پێشوازی لێکرا.

زانیارییەکانی (لۆك) کارێکی زۆریان کردە سەر ئەدەبیاتی ئینگلیزی، بابەتی پەروەردەکردنی مرۆڤ سنوری خوێندنی قوتابخانەیان بەزاند ئەمەش بەشێوەیەکی دیار لە رۆمانەکانی سەدەی هەژدەهەمدا بەدەرکەوتن.

له فەرەنسادا گرنگی مێژوویی بزوتنەوەی رۆناکبیری، ئامادەکردن بوو بۆ شۆڕشێکی سیاسی کە بابەتی نیشتمانپەروەری بەخۆوە بینی. هەوڵیاندا بۆ رۆناکبیری کردنی عەقڵ لە پێناوی شۆڕشی داهاتوودا، بەگیانێکی شۆڕشگێڕانەوە، هەڵسوکەوتیان دەکرد، ڕەخنەیان لەهەموو بیروباوەڕو بۆ چوون و یاسایەکی کۆن دەگرت و هەموو شتێکیان دەخستە بەر. دەوری عەقڵەوە زۆربەی زۆری فەیلەسوفەکانی رۆناکبیری میسالی بوون لەتێکەیشتنی یاساکانی پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتیدا هەموو هیوایەکییان خستە کارەوە بۆ پەروەردەکردنی مرۆڤ و رۆناك کردنی هۆشی ئەم بزوتنەوە فیکری و رۆناکبیرییەی جیهانی، لەرێگای زمان و ئەدەبیاتی تورکییەوە، کاریان کردە سەر فیکر و بۆچوونی (حاجی‌یەوە) لە ساڵی (١٨٠٦-١٨٩٥)دا بزوتنەوەیەك لەئەدەبی تورکیدا ڕوویدا کە پێیان دەوت (بزوتنەوەی تەنزیمات) لە ئاکارەکانی ئەم بزوتنەوەیە وازهێنان لەئەدەبی کلاسیکی و لاسایی کردنەوەی ئەدەبیاتی ئەوروپی بوو، هەروەها بایەخی زۆریان بەناوەرۆك دەدا نەك شێوە جەختیان لەسەر ئامانجی کۆمەڵایەتی ئەدەب دەکرد، دوورکەوتنەوە لە بۆچوونی تاکە کەسی و رێبازی سپی بینیان گرتە بەر ئەم بزوتنەوەیە بە سەرۆکایەتی ئەدیبی ناسراو(ئیبراهیم شوناسی)بوو، کە دامەزرێنەری رۆژنامەیەك بوو بەناوی (تەرجومانی ئەحوال)ەوە کەبایەخی زۆری بە وەرگێڕانی ئەدەبیاتی ئەوروپاییەوە دەدا، لەنووسەرانی ئەم ڕێبازە (ئەحمەد وەفیق) و نامیق کەمال بوون، رۆژی لێسکۆت دەڵێت: ((ئەو دەنگە نەتەوەییەی لە شیعرەکانی (خانی)یەوە بیستمان لەلای حاجی شێوەیەکی نوێخوازی تری بە خۆوە بینی، ئەم شاعیرە رۆڵێکی باشی

بینی لەهۆشیاری نەتەواییدا، شیعرەکانی کە لەدوای خۆیەوە بۆی بەجێ هێشتووین بوونەتە مایەی شانازی پێوە کردن)).١.

حاجی شاعیری خەبات و تێکۆشانە، هەڵوێستی شۆڕش گێڕییە، نارەزایی دەربڕینە بەرامبەر داگیرکەرانی کوردستان، شیعرە سیاسیەکانی بەردەوام بوون، خۆڕاگرتن، بەرەنگار بوونەوە، داکۆکی کردن، کۆڵنەدان، بەرگری کردن دەگەیەنێ، پەیوەندیەکی بەهێزو لەبن نەهاتوویان بەخاك و زێدی کوردستانەوە هەیە، شاعیر بۆ رزگاریو سەرفیرازی کوردستان و دروست بوونی دەوڵەتی کوردی شیرو قەڵەم و یەکگرتن بەسەر پشك دەزانێ:-

بەشییر و خامە دەوڵەت پایەدارە
ئەمن خامەم هەیە، شیر نادیارە
نەبەیداغی هەیە نەتەبڵو کووسی
ئەمەندەی پێ کرا بێ چارە نووسی
وە ظیفە ی خۆم بەجێ هێنا تەمامی
بە شییرو دەوڵەتە میللەت نیظامی(٢).

حاجی چەك و تیۆری پێشکەوتنخواز بەهەوێنی سەرکەوتن دادەنێ، بۆ ئەوەی مافی چارەنووسی خۆی دەستە بەردار بکات و دەوڵەتی کوردی دامەزرێنێ، دیارە دروست بوونی دەوڵەتی کوردی تاکە رێگای سەرکەوتنە، بەلام مافی ئەتۆنۆمی و فیدرالی و مافی کەلتوری چارەسەری کاتین و هەردەم داگیرکەرانی کوردستان وەکو تاکتیك و لەکاتی پێویست دا لەگەڵ کوردا پەیرەوی دەکەن. هەر هەڵیان بۆ هەڵ کەوێ بە ئاگر و

ئاسن دەکەونەوە گیانی کوردان بۆیە پێویستە هەموو لایەك بۆ مافی سەربەخۆیی، یەك بگرن و هەوڵی بۆ بدەن:-

گوا ئەو دەمەی کە کوردان ئازاد و سەربەخۆ بوون
سوڵتانی موڵك و میللەت، صاحیبی جەیش و عیرفان
جۆشێك بدەن وەکو هەنگ تەگبیر بکەن بەبێ دەنگ
ئەسبابی شەڕ پەیدا بکەن تۆپ و تفەنگ و هاوان(۳).

بەلآم بەداخەوە دووبەرەکی و ناڕێکی نێوان کوردان بۆتە کارەساتێك ئەوە دوای ئەوە دووبارە دەبێتەوە هیچ سوودێك لە ئەزموونی تاڵی کوردان وەرناگرن، هەردەم ئاسنی سارد دەکوتنەوە، سیاسەتمەداران بەرژەوەندی تایبەتی فەرامۆش ناکەن و بۆ بەرژەوەندی گشتی نەتەوەیی تێناکۆشن، بۆیە بەژێر دەستی دەمێنیتەوە و پلانی ئەم و ئەو جێبەجێ دەکەن کە بەزەرەروو زیانی کوردان تەواو دەبێت.

لەبەر حیزبە بخۆیی و ناتەبایی
لەژێرحیزی حیزبان بووینە دۆشەك
هەتا وەکو ئاگری بن کا بن لەگەڵ یەك
ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان بە پووشەك
لە گوێی گا نووستن بۆ یێکە ڕێوی
لەسەر ئێوە وەها شێرگێڕە وەك سەگ(٤).

ئەرکی شیعر لای حاجی لە قۆناغی رزگاری نەتەوایەتیدا هۆشیار کردنەوەو هەڵوێست وەرگرتنە بەرامبەر واقعی نالەبار و یاخی بوونە لەپێناوی دوا رۆژێکی رۆناکدا ترسناکی داگیرکەر لەوەدایە، کە هەردەم دەیەوێ شارستانێتی و رۆشنبیری نەتەوە بن بڕ بکات، بۆیە حاجی

جۆش و خرۆشی تێ دەکەوێ و ئالأی زانست و رۆشنبیری بۆ گەلەکەی بەرزدەکاتەوە:_

هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت
بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت
بێگانە بە تەرجەمەی زوبانی
ئەسراری کتێبی خەلْقی زانی
یەکسەر عەولەما درشت و ووردی
ناخوێننەوە دوو حەرفی کوردی(٥).

(محمود درویش) دەلێت ((شیعرەکانمان بێ رەنگن بێ تامن، بێ دەنگن، ئەگەر نەبنە چراو لە مالێکەوە بۆ مالێکی تر و کەسانی ساکار و سادە لێی تێ نەگەن))(٦)

حاجی شاعیری بەرهەلستکار شیعرەکانی جەماوەرین تەعبیر لە هەست و نەستیان دەکات، گۆرانی بۆ سەرکەوتنیان دەلێت زۆر وودبینانە دبلۆماسیانە رێرەوی کێشەی گەلەکەی دیاری دەکا جا دەفەرمووێت بۆ تەکتیکیش بێت پێویستە سەربە دەولەتێك بین، چونکە چاك زانیویەتی بێ پشتیوانی زلهێزەکان مەیسەر بوونی دەولەت ئاسان نابێت، بەتایبەتی بۆ گەلێکی پێنج پارچەکراو، هەر چەندە متمانە بەخۆ کردنیشی لە پێش هەموو شتێکەوە داناوە،

لەم بەینە ئیتتیفاقێ پەیدا بکەن بە مەردی
فەرقی نەبێ شوان و جوتیار و میرو گاوان
گەر هیچ نەبێ بە ئۆین تابیع بە دەولەتێ بن
بێگانە چاکە دوشمن نەك دوشمنی خۆتان(٧).

له کۆتاییدا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە حاجی شۆڕشێکی فیکری و هونەری لە شیعری کوردیدا بەرپاکردووە، شیعرەکانی بیرە وردەکانی بنیادی نوێخوازیان لەئەدەبی کوردیدا چەسپاندووە و بوونەتە سەر مەشق و نەوین بۆ شیعری نوێی کوردی و تاجی سەروەری لەسەر ناوە خودی خۆشی لەم بارەیەوە دەڵێت:-

(حاجی )یە شیعرەکانی وەك کاوە

ڕۆژێ دەبینین درەفشی هەڵداوە(٨)

## سەرچاوەکان


1- Roger Lescot. In Encyclopedie dela pleiade p,801-802.

٢- سەردار میران و کەریم شارەزا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، ئەمینداریێتی رۆشنبیری هەولێر ١٩٦٨، ل٨٧.

٣- هەمان سەرچاوە، ل٨٦-٨٧.

٤- هەمان سەرچاوە، ل٧١.

٥- هەمان سەرچاوە، ل٢٦٣.

٦- یاسین احمد فاعور، الثورة في الشعر محمود درویش، دار المعارف للطباعة و النشر ، تونس ١٩٨٩.

٧- دیوانی حاجی قادر، هەمان سەرچاوە، ل٨٦.

٨- هەمان سەرچاوە، ل١٩٤.


* * *

## دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز

لە گرمەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لەو کاتەدا کە شەڕێکی تەماح کاری بەهۆی دامودەزگا ئیمپریالیستەکانەوە هەموو گێتی گرتبووە، ئەو شەڕەی کە سوود و قازانجی وولاتە ئیمپریالیستەکانی ئەورووپای تێدابوو، ئەویش بە مەبەستی دابەشکردنی میراتی دەوڵەتی عوسمانی بوو لەنێوان ئەو دەوڵەتانەدا، ئا بەم جۆرە جەنگ کۆتایی هات و وولاتە سەرمایەدارەکان کەوتنە خۆ بۆ دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی بەگوێرەی بەرژەوەندییە ئابووریەکانیان، کوردستانی خۆشەویستمان بەسەر چوار وولات دابەشکراو، زۆرداران کەوتنە فڕان فڕانێ هەر مەپرسە چ ڕۆژێ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەیەها بانگەوازی دیموکراتی و مافی گەلانی ژێر دەست دەدرا بە گوێی خەڵکیدا بۆ هەڵ خەڵەتاندن و تەفرێوەدانیان تاوەکو بگەنە مەرامی خۆیان ئا لەو کاتەدا (دڵدار) پێی نایە جیهانەوە لە ٢٠شوباتی ١٩١٨، کاتێك فامی کردەوە و خۆی بینی هەستی کرد مرۆڤی نەتەوەیێکە کەناوی نەتەوەی کوردە ئەو کوردەی کە لەزۆر کۆنەوە خاوەنی شارستانێتی بووە و جڵەوی فەرمان ڕەوایی بەدەست خۆیەوە بووە، لەگەڵ ئەوەی کە نەتەوەیێکە لەو نەتەوانەی هێشتا چارەنووسی خۆیان نەکەوتۆتە دەست خۆیان، (دڵدار)ی شاعیر لەناو نەتەوەیێکی وادا دەکەوێتە شیعر ووتن و خەیاڵ کردنەوە.

دڵدار، ناوی یونس)ە کوڕی مەلا ڕەئوف کوڕی مەلا مەحمود ئەفەندی کوڕی مەلا سەعدی خادیمولسەججادەیە.

دایکی ناوی (زەهوە)یە، کچی خورشید ئەفەندییە، لە مەلا زادەکانی ناوچەی زەهاون.

((دڵدار))لەناو بنەماڵەیێکی مووچە خۆری بچووك پەروەردە بووە، هەر لەتەمەنی مناڵیەوە ئەم شارو ئەو شاری پێکراوە، هێشتا تەمەنی یەك ساڵان بووە، کەباوکی هێناویەتی‌یە هەولێر لەبەر کاری میری باوکی گوێزراوەتەوە بۆ رانیە، پۆلی یەك و دووی سەرەتایی لە رانیە خوێندووە، پاشان لەگەڵ باوکی پێکەوە گەڕاونەتەوە شاری کۆیە، خوێندنی سەرەتایی لێ تەواو کردووە، هەر لەتەمەنی لاویدا خولیای شیعر و ئاشنای شاعیرە کلاسیکیەکانی کورد بووە، لەم ڕووەوە خۆی دەڵێ:-

هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووم کەدیوانی حاجی قادری کۆییم زۆر تری لەبەر کردبوو، هەمیشە بە وردی سەرنجم لە هەڵبەستەکانی عەونی و راجی و عاصی و حوسێنی و هیرانی دەداو لەبەریشمدکردن، بەوانەش نەبوم نەبروم هەڵبەستی هەرکەسێکم دەسکەوتبایە دەمنووسیەوە و لەبەریشم دەکردن، بەتایبەتی هەڵبەستی وەفایی، کوردی، بێکەس، زێوەر ، پیرەمێردم، زۆر لەبەر کردن و لەو ساڵەدا هەستم بەوە کرد کە چێژ لە هەڵبەست وەرگرم زۆر گیرۆدەی بووبووم[٢]، ئەوەی شایانی باسە (دڵدار)ی شاعیر رۆژ بە رۆژ لە گۆڕان و پێشکەوتن و پەرەسەندنا بووە، گەلێ شەونخوونی و هەوڵ و تەقەلای بێ وچانی‌داوە بۆ پەروەردە کردن و پێگەیاندنی خۆی و فراوان کردنی ئاسۆی بیری بە خوێندنەوەی کتێبی هەمە چەشنە لەبارەی مێژووی کورد و شۆڕشەکانی جیهان و ئەدەبیاتی ئەوروپی‌یەوە، لەکۆتایی بیستەکان لە بەغدا بڕیار درا کە کۆمەڵێکی سیاسی و نهێنی

---

(٢) گیوی موکریانی، دیوانی دڵدار، چاپی دووەم ، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧١، ل٨.

دابمــەزرێنت، ئــەم کۆمەڵــە لــە ١٠-٧-١٩٢٧دامــەزرا بــەناوی (کۆمەڵــەی پشتیوان)، لقی پشتیوان بەهەموو شارەکانی کوردستاندا بلاّو بووەوە، لە ئەندامە وریا و کارامەکانی شاری هەولێر ئاسەف رەئوف بوو[٣]، کە برا گەورەی (دڵدار)ی شاعیرە. ئەحمەد خواجە دەڵێ:-

- لەگەڵ ئاسەف رەئووف کۆیی تێ ئەکۆشاین زۆر نامەی نەهێنیمان ئەنووسی بۆ متصرف و وەزیرەکان و داوای نووسین و خوێندن بە کوردی ئەکرا[٤].

جا کۆمەڵی پشتیوان دەوری باشی هەبوو لەوریا کردنەوەی مرۆڤی تێکۆشەر بەتایبەتی ئاسەف رەئووف دەورێکی باشی هەبوو، لە پەروەردەکردن و بەهێز کردنی گیانی نیشتمان پەروەری لای شاعیر.

لە ساڵی ١٩٣٥دا (دڵدار ) ڕوو دەکاتە هەولێر بۆ خوێندنی قوتابخانەی ناوەندیی، نیوەی یەکەمی سییەکان سەرەتای چالاکی بزوتنەوەی کوردایەتی کەوتە ناو لاوان و قوتابیانی کوردستانەوە، (دڵدار)ی ئەمریش وەکو قوتابیەکی تێکۆشەر دەوری دیار دەبینێ لەڕیزی قوتابیانی کوردستانی هەولێردا، ئەم چالاکیەش بە روونی لە یاداشتەکەی شاعیردا دەبینرێ.

((شاعیر لاپەڕەییکی گەش لە خەباتی قوتابیان لەپێناوی کوردایەتی لە قوتابخانەی ناوەندی هەولێر لە ساڵانی ١٩٣٥-١٩٣٦ ڕوون دەکاتەوە))[٥].

---

(٣) ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی سێ یەم،چاپخانەی ڕاپەرین، سلێمانی، ل٢٥.

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨.

(٥) د مارف خەزنەدار، ((شاعیری ماوەی تاقی کردنەوە و گواستنەوە))، کۆلێجی ئەدەبیات چاپخانەی دار الجاحظ، ژمارەی ( ٢٠-٢١ )، بەغدا ١٩٧٧، ل٢٧.

دەرچوونی گۆڤاری رووناکی لە سالّی ١٩٣٥ لەهەمان شاردا، دەوری باشی بینی لەپێشخستنی ئەدەب و فراوان کردنی بیری نەتەوایەتی، (دلّدار)ی شاعیریش یەکەم شیعری لە گۆڤاری ناوبراودا بلاّوکردۆتەوە.

سالّی ١٩٣٨ بۆ تەواو کردنی قوتابخانەی ئامادەیی روو دەکاتە شاری کەرکوك)) لە شاری کەرکوکدا شاعیر دەبێتە ئەندامی (کۆمەلّی دارکەر) ئەم کۆمەلّەیە لاسایی کردنەوەی کۆمەلّەی کاریۆناری ئیتالّیا بووە، دەستەی دامەزرێنەرانی یەکەمین کۆبوونەوەیان لە باغی (ام الربیعین) لەکرکوك کردووە، ئەوانەی لەو کۆبوونەوەیە بەشدار بوون زۆر بوون لەمانە موکەڕەم تالّەبانی، شێخ حوسێنی بەرزنجی، شێخ مارف بەرزنجی، یوونس رەئووف دلّدار))[٦].

سالّی ١٩٣٨ پارتی هیوا لە بەغدا دامەزرا، هیوا رۆلّێکی باشی بینی لە بلاّوکردنەوەی بیری نەتەوایەتی و بنکەیەکی باشی لە ناو زۆربەی زۆری چینە جیاوازەکانی کۆمەلّدا دامەزراند،

ئەم حیزبە بە گەورەتر و بە هێزتر تەنانەت حیزبە ئاشکراکانی عیراقیش دادەنرا، خوێندەوەرانی کورد، ئەفسەران، سەرۆکانی عەشایر، کاربەدەستان لەناو جغزی ئەم حیزبەدا بەشیان هەبوو، مەرکەزی حیزب لە بەغدا بوو، پەلی بۆ هەموو وولاّتانی کوردەواری هاویشت بوو، تەنانەت بۆ (ئیران و سوریا)ش دەتوانرێ ئەم حیزبە تا ئەو تەئریخە لە گەورەتر حیزبێکی کورد بووە[٧].

لەسالّی ١٩٤٠دا، شاعیر بۆ خوێندنی کۆلێجی حقوق بۆ بەغدا چووە، لەوێدا دەبێتە ئەندامی حیزبی هیوا، هەر ئەو ئەندامییەش (دلّدار)ی

---

(٦) ئەم زانیاریەم لەنامەی تایبەتی مامۆستای هێژا مارف خەزنەدارەوە، لە ١٩٨٢/٩/١٩دا پێگەیشت.

(٧) علاءالدین سجادی، شۆرشەکانی کورد و کۆماری عیراق، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ، ١٩٥٩، ل١٧٥.

لـه مامۆسـتا رەفیـق حیلمـی نزیـك كردبـۆوە، چـونكە وەكـو ئاشـكرایە مامۆستا رەفیق حیلمی سەرۆكی حیزبی هیوا بوو.

لـە چلەكاندا دام و دەزگـای هیتلـەری فاشیسـت لەبـەردەم خـەباتی رەوای گەلان تێكشكێنرا، بەرپابوونی بزوتنـەوەی رزگـاری خـوازی لـەزۆر شوێنی گێتیدا، شۆڕشی مەزنی گەلی چین دەروازێكی فراوانیان لەبەردەم گەلانی ئاشتی خواز ئاوەلا كردو بوون بەسەر مەشق و هەوێن بۆ گـەلانی تر. گەلی عیراقیش بـە عـارەب و كـورد و كەمـە نەتەوایـەتی یەكانیـەوە، كەوتنـە جموجـۆڵی سیاسـییەوە، كۆمـەڵی ڕێكخـراو پـارتی پێشـكەوتوو هاتنـە كایـەوە، بـۆ هێنانـەدی دیموكراسـی و سەربەسـتی لـە سەرانسـەری عێراق دا.

"جا پارتی كۆمۆنیستی عیراقی چـاك دەیزانـی كـەمیری بـە ئاشـكرا ئیجازەی كاركردنی پێ نادا، بۆیە چەنـد ئەنـدامێكی خۆیان تـەرخان كـرد بـۆ دامەزرانـدنی (حـزب التحـرر الوطني)، داواكارییـێك لەلایـەن حوسـێن محەمەد الشبیبی، محەمەد حوسێن ئـەبو لعیسـی المحامی، محەمـەد سـالح سەعید المحامی پێشكەش وەزارەتی ناو خۆ كرا"[٨].

ئەم حیزبە كەوتە چالاكی نواندن، هەر چەندە بە ڕەسمی ڕێگـەی ئیش كردنی پێ نەدرا، لە چالاكیەكانی ئەم حیزبە هەڵسان بـە ئاهـەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦ و ١٩٤٧. لقی حیزب لەهەموو پارێزگاكـان پێـك هـات، گەلێ رۆشنبیر و پێشكەوتنخواز چوونە ریزی حیزبەوە لەمانە (دڵدار)ی شاعیر بووە. ئەحمەددلزار دەڵێ:-

---

(٨) سعاد خيري، من تاريخ الحركة الثورية المعاصرة في العراق، الجزء الاول مطبعة الاديب البغدادية، بغداد، ص١٢٤ — ١٢٨.

سالّی ١٩٤٦دوای تەواو کردنی خزمەتی سەربازی گەڕامەوە بۆ کۆیە، چەند هاوڕێیێك داوایان لێکردم، کە لەڕێزی (حزب التحرر الوطني)دا کاربکەم، کەهەوڵ ئەدرا بۆ وەرگرتنی ئیجازەی کار بەشێوەیەکی ئاشکرا، لەمانە شاعیری پێشکەوتوو (یوونس رەئووف)بوو، لەسەرەتادا تۆزێ گومانم کرد، بەلاّم کە کەریم ئەحمەدم بینی کە لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بەمامۆستا دامەزرابوو، دەستم کرد، بەکارکردن لەڕێزی (حزب التحرر الوطني) لەلایەن حیزبەوە راسپێردرام کە چاودێری کتابخانەی حیزب بکەم، کە تەرخان کرابوو بۆ فرۆشتنی نامیلکەی حیزب و رۆژنامەو گۆڤاری پێشکەوتوو لەمانە گۆڤاری رێگەی لوبنان بوو[٩].

گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩ - ١٩٤٩) رۆڵی کارگەری بینی لە بلاّوکردنەوەی بیری پێشکەوتنخوازو پەرە پێدانی ئەدەبی کوردی توانی کۆمەڵێ شاعیر و رۆشنبیری لاو لەدەوری خۆیدا کۆ بکاتەوە، (دلّدار) شاعیر و ئەدیب کە قوتابی حقوق بوو لە بەغدا ئاشنایی لەگەڵدا پەیدا دەکاو پەیتا پەیتا ووتاری کۆمەلاّیەتی و ئەدەبی تێدا بلاّو دەکاتەوە.

دوای تەواو کردنی خوێندنی زانستگا واتە سالّی ١٩٤٥ دەگەڕێتەوە بۆ شاری هەولێر و دەبێتە پارێزەر بۆ ماوەی سێ سالّ تا لە ئێوارەی رۆژی ١٢ی تشرینی دووەمی سالّی ١٩٤٨دا، زۆر بە ناوەخت دلّە گەورەکەی لە لێدان دەکەوێ و مالّ ئاوایی یەکجاری مان لێ دەکات و کەلێنێکی دیار دەخاتە ناو ئەدەبی کرێکار و جووتیارانی کوردستانەوە بەم جۆرە چینە

---

(٩)الثقافة الجديدة ، السنة ٣١ العدد ٥ ، ١٩٨٤ ص ٩٨-٩٩.

چەساوەکان پارێزەرێکی زۆر بیر وردو خەیاڵ تیژیان لەکیس دەچیٚ کە لەتەنگانەدا بەرگری لیٚ دەکردن.

بەبۆنەی کۆچ کردنی شاعیرەوە (ئەحمەد دڵزار)ی شاعیر هەست و سۆزی خۆی دەردەبڕیٚ بەناوی (شین بۆ دڵدار)ەوە دەڵیٚ:-

| | |
|---|---|
| هەی ڕۆ کاکە ڕۆ دڵدارم ڕۆ | هاوڕێی بە نرخ و بەها دارم ڕۆ |
| شاعیری گەنج و پڕ شعورم ڕۆ | ئەدیبی گەورەو بیٚ قسورم ڕۆ |
| محامی گەلی هەژارانم ڕۆ | ڕیٚ نیشاندەری بیٚ یارانم ڕۆ |
| (دڵدار)ی زاناو زۆر فەننام ڕۆ | خاوەنی بیری بەرزو جوانم ڕۆ[10]. |

* * *

## ( دڵدار و شیعری جوتیاران )

دڵدار لە سییەکاندا وەکو هەڵبەستەوانێکی نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕ هەوڵی هۆشیار کردنەوەی لاوان و خەڵکی کوردستانی داوە، پاڵی پیٚوە ناون بۆ خەبات و تێکۆشان لەپیٚناوی هیٚنانەکایەی ڕژیٚمیٚکی دیموکراسی گەلی، بەلاٚم لەشیعری توتنەوان و لالە باسدا بەرەو خەباتی چینایەتی هەنگاو دەنیٚو وەکو شاعیرەکی تر خۆی نیشان دەدا شاعیری جوتیاران شاعیری زۆربەی زۆری گەل مەسەلەی نەتەوایەتی بە

(١٠) ئەحمەد دڵزار شین بۆ دڵدار گۆواری گەلاوێژ چاپخانەی مەعاریف ژمارە ١٢، بەغدا ، ١٩٤٨، ل٤٠.

مەسەلەی جوتیاران دەبەستێ. (ستالین) واتەنی بزوتنەوەی نیشتمانی لەناوەڕۆکدا بزوتنەوەی جوتیارانە.

هۆی ئەم ئاسۆ ڕونیەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شاعیر دەچێتە ڕیزی پارتێکی کۆمۆنیستەوە، دەبێتە خاوەنی ئایدۆلۆجیایەکی دیاریکراو، لە بۆچوونەکانی، کە ئایدۆلۆجیایی جوتیار و کرێکارانە لەو ڕوانگەوە دەڕوانێتە مەسەلەکەو دەڵێ:-

هیچ بزوتنەوەێ سەرکەوتوو نابێت، ئەگەر خەباتی نەتەوایەتی و چینایەتی پێکەوە ئاوێتە نەکات و لەو پێودانگەوە هەنگاو نەنێ.

شاعیر زۆر سەرکەوتوانە لەچینەکانی ناو کۆمەڵ گەیشتووە، بۆیە هاتووە باسی چینێك دەکات کەلەسەدا هەشتای کۆمەڵی کوردەواری لێ پێك دێ، هەوڵی دەرخستنی چەوساندنەوەی چینێکی سەرەکی کۆمەڵەی داوە، بۆ بەرگری کردن لە مافی ڕەوای خۆیان، کە (ماوتسیتۆنگ) بەهێزی شۆڕشی دەزانێ، هەر وەکو مارکسی -لینینی دەریخستووە کە ئەم چینە دەبێ پشتی پێ ببەسترێ لەکاتی خەباتدا، چونکە زۆربەی هەرە زۆری گەل لەوان پێك دێت و خاوەنی هیچی خۆیانن و ڕەنج دەدەن و بەرهەمی ڕەنج و ئارەقیان لەلایەن دەرەبەگەوە دەمژرێ، لەشیعرەکانی شاعیر ئەم ڕاستی‌یە بە ڕوونی خراوەتە ڕوو کەچۆن لادێی کوردستان هەوڵ و کۆششی دەدەن، دەرەبەگ و ئاغاو کێخوا و دارو دەستەکەیان بەنووکی تفەنگ لێیان زەوت دەکەن ولە مافی ڕەوای خۆیان بێ بەشیان دەکەن، لەئەنجامی ئەم کارەش چ جۆرە ژیانەکی ناخۆش و پڕ لە کولەمەرگی و ناهەمواری ژیان دەبنە سەرو چ جۆرە تالاوێك دەچێژن بۆیە لە شیعری لالەباسدا دەڵێ:-

ئەوا چل ساڵە زەوی ئەکێڵم

فەللاحی ئەگەم هەتاکو ئیمڕۆ
نرخی عارەقەی ڕوونی ماندوییم
تیکە نانێکە، چەنان ؟ نانە جۆ
ئەویش بەبێ دۆ[1].

شاعیر دونیای دواکەوتووی لادێی کوردستان و چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە دەخاتە ڕوو کەچۆن جووتکار لەڕووی شارستانێتییەوە دواکەوتوون کەچی ئاغا و دەرەبەگ لە کۆشك و خانووی پڕ لە کەرەسەی پێویست ژیان بەڕێ دەکەن، بۆ نموونە لەتوتنەواندا دەڵێ:-

ناو ماڵی ئاودێر هەرزاڵەیێ چووك
دوو پارچە بەڕی شڕ و هەڵزڕاو
جەڕکەیکی کۆن، سێ گۆزەی کەرخیو
چەند هامانی ڕەش، جامێکی قوپاو[2].

شاعیر دەست نیشانی شتێکی گرنگی کردووە لەژیانی لادێدا، ئەویش نەخۆشی و دەردەدارییە، کە چۆن تەنگی پێ هەلگرتوون، لەتوتنەواندا دەڵێ:-

ئافرەتێك لەولا، لاڵ و پاڵ کەوتو
بێ هۆش لەبەرتا، لە برسا ژاکاو
منداڵێکی لەڕ عومری شەش ساڵان
لەپێ ڕووکەوتوو، بێ مل پەشۆکاو[3].

ڕوویەکی تری چەوساندنەوەی جووتیاران بێ گاری و سوخرە پێ کردنە لەلایەن دەرەبەگەوە، لەشیعری (لالەباس)دا، ئەم ڕاستییە

دەبینرێ کە ئاغا چۆن لەگەڵ جووتیاران مامەڵە دەکات، چ ڕاستەوخۆ چ لەلایەن چڵکاو خۆرەکانیەوە بێ،

ووتی لەهاوین کێخوا کاکە سوور
هاتە ماڵەوە پێی ووتم لالۆ
شایەدی بدە زەوی زێرین دۆڵ
کەوا هینی منە قورئانیش بخۆ[٤].

لەووڵاتی دواکەوتووی نیمچە دەرەبەگیدا، میری پشتگیری ئاغا و خاوەن موڵکدارەکان دەکات دژبەچینی چەوساوە،لەم ڕووەوە (لینین) دەڵێ:-

دامو دەزگاکانی دەوڵەت هەر لەسەرەتای دروست بوونیەوە لەگێتیدا امودەزگایەك بووە، بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندی چینی دەسەلاتدار و هاوپەیمانەکانی هاتۆتە کایەوە، دڵدار لە (لەلاباس)دا:-

لە کۆیە چوومە لای زابت ووتم
ئەفەندی عومرم گەییە حەفتاو نۆ
بێجگە لەم کوڕە و وجاغم کوێرە
بەمنی ببەخشە مەمکە ڕەنجەڕۆ
زابت تووڕە بوو هەڵسایە سەر پێ
فڕێی دامە دەر بەپاڵە پەستۆ[٥]

بەشێکی تر لەهاوپەیمانەکانی دەرەبەگ لە کوردستاندا مەلا کۆنەپەرستەکان بوون کە پشتیگیرییان لەئاغاکان دەکرد، ڕاستیان بە درۆ دەخوارد بۆ ئەوەی ئاغا پاداشتیان بداتێ و لەئاغا نزیك ببنەوە، لەتوتنەواندا ئەم ڕاستیە بەدەر دەکەوێ،

مەلا دەفتەری سەرەو ژێر دەکرد
عەولا مونتەزیر مل کەچ و داماو

کێخـوا سمێـڵی مشت و ماڵ دەکرد

منیش بیر لە سەر عەولای ماڵ ڕماو(٦)

لەم دوو شیعرەدا واتـە لـە شـیعری (توتنـەوان و لالـەباس)دا شـاعیر بـــەرەو ریـــالیزمی ڕەخنەگرانـــە هـــەنگاوی نـــاوە وێنـــەی ڕیـــالیزمی ڕەخنەگرانەی تێدا دەبینرێ، جابـا بـزانین ریـالیزمی ڕەخنـەگرانـە، چی دەگەیەنێ؟ ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە ئەوەیە کە شاعیر واقیعـە نالەبارەکـە دەخاتــە ڕوو، لەگــەڵ ڕەخنــە لــێ گــرتنی بــەهیوای چارەســەر کردنــی، (دڵدار)ی شاعیریش ئەم شتانەی لەتوتنەوان و لالەباسدا پەیڕەو کردووە، چەند خاڵی سەرەکی لەم دوو شیعرەدا بەرچاو دەکەون،

١. دەمەتــەقێکی ڕەخنەگرانەیــە لــەنێوان دوو چــینی کۆمــەڵ، چــینی دەرەبەگ و چینی جوتیار.
٢. شاعیر بەشێودیەکی ڕاستگۆ ئەم ڕاستییەی وەکو خۆی خستۆتە ڕوو.
٣. هۆشیارییان دەکاتەوە لەکەم و کوڕییەکانیان ئەمەش خۆی لەخۆیـدا چارەسەرێکە بۆ مەسەلەکە.
٤. زمـانی ئـەم دوو شـیعرە، زمـانێکی سـاکار و سـادەیە، زمـانـی زۆربـەی زۆری گەلە، شاعیری گەلیش ئەو شاعیرەیە کە زۆربەی خوێندەواران بەلای خۆی رادەکێشێ و هەستو نەستیان تێدا دیار دەکات و خۆیانی تێدا دەبیننەوە لەم ڕووەوە (نازم حیکمەت)ی شاعیر دەڵێ:-

هونـەرمـەندی گەل دەبێ پێش هەموو شتێ گەل تێی بگا و بەڕاستی هونـەرمەندی ڕاستەقینەی گەلەکەی بێ.

**سەرچاوەکانی ئەم باسە:**


١. گیویی موکریانی، دیوانی دڵدار، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧١، ل٥٨.

٢. هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

٣. هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

٤. هەمان سەرچاوە، ل٥٩.

٥. هەمان سەرچاوە، ل٥٨.

٦. هەمان سەرچاوە، ل٧٢.


## (دڵداری)ی سیاسی لە بیرەوەری شاعیر و رۆشنبیراندا

(دڵدار) شاعیر و تێکۆشەرێکی، خاوەن هەڵوێست بوو، سەراپای ژیانی پڕ لەخەبات و رەنجدان بووە، لەپێناو گەلە ستەمدیدەکەیدا، دڵدار بیری ئەوەی کردۆتەوە کە بیرەوەریەکانی خۆیمان بۆتۆمار بکات، چ تۆمارکردنێك کە بەشێوەیەکی هونەری زۆر جوان و لێهاتووانە بەنموونەیەکی بەپێزو دانسقە دادەنرێت لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا

دڵدار لەوتەمەن کورتەیدا، چالاکی و جموجۆڵی پڕ بەهای خستۆتە ڕوو، چ وەك شاعیر چ وەك خەباتکەرێکی مەیدانی سیاسەت ڕۆڵی دیارە.

شیعرەکانی ئەی ڕەقیب، گوڵی سوور، خەندەکەی بایی‌و چەندانی تر بەرهەمی سەرکەوتووی دڵدارن، ئێمەی کورد قەرزاری دڵداری شاعیرین بۆیە پێویستە ئاوڕی لێبدرێتەوەو پەیکەرێکی نازداری لەشارەکەی کۆیە بۆ بکرێت،

(دڵداری)ی شاعیر و سیاسی لەناو خێزانێکی کورد پەروەر و تێکۆشەر چاوی بەدونیا هەڵهێناوە، هەر لە منالیەوە برا گەورەکەی (ئاسەف) بەگیانی نیشتمان پەروەری و کوردایەتی پەروەردەی کردووە، جا با بزانین خودی دڵدار چۆن ئەم بیرەوەرییەی خۆییمان بۆ دەگێڕێتەوە (پاش نیوەڕۆ بوو کە لەهەیوان دانیشتبووین چایمان دەخواردەوە کە ئاسەف لێی پرسیم، تۆ چیت؟ جوابم دایەوە من یونسم چ بم، ئینسانم ووتی مرازم ئەمە نییە یەعنی خۆت بە کورد یان تورك یان ئینگلیز دائەنێیت، پاش گفتوگۆیەکی زۆر کە هیچی لێ تێنەگەیشتم بەلام یەك شتی لە عەقیدە و ئیدیعا گۆڕیم کەئەویش لێیان پرسیم تۆ چیت بڵێم کوردم)[1] لە کۆتایی بیستەکاندا لە بەغدا بڕیار درا کە کۆمەڵێکی نهێنی سیاسی دابمەزرێت ئەم کۆمەڵە لە ١٩٢٧/٧/١٠دامەزرا، بەناوی (کۆمەڵەی پشتیوان) لقی پشتیوان لەهەموو شارەکانی کوردستاندا بلاو بۆوە، ((لەئەندامە وریاو کارامەکانی شاری هەولێر ئاسەف ڕەئووف بوو)) ئەحمەد خواجە دەڵێ:-

(لەگەڵ ئاسەف ڕەئوف کۆیی تێئەکۆشاین زۆر نامەی نەهێنیمان ئەنووسی بۆ متەسەریف و وەزیرەکان و داوای نووسین و خوێندن بە کوردی ئەکرا) ڕۆژێکیان ئەحمەد خواجە لەلای ئاسەڤ برام بوو پێی

ووتم(یونس کوا شاهیدت که تۆ کوردیت؟ ووتم ئاسەف شاهیدمە، ووتی ئاسەف بەشاهید ناشێ، ئیتر نەم ئەزانی چۆن جوابی بدەمەوە، لەپاشان ووتی من شتێکت ئەدەمێ که ووتیان بەچی بزانین تۆ کوردیت ئەم شتەیان نیشاندە))[٢] منیش ڕەسمەکەم وەرگرت و زۆر کەیفیشم پێ خۆش بوو، که ڕەسمی مەلیکی کوردستانم لەلابێ، بەلام کوردستان لە کوێندەرە؟ ئەمەم نەئەزانی و له کەسیشم سوئال نەدەکرد، پاش دوو ڕۆژ موجەلەیەکی میسریم شەق و پەق کرد ڕەسمەکانیم دەرهێنا وەك شریت بە سمخ بەیەکترەوە نووساندن ڕەسمی مەلیکی کوردستانیشم لەگەڵ وان تێکم بەست ئەو سەری شریتەکەم لەدارێك خست و سەرەکەی تریشم لەدارێکی تر خست و دارەکانم له سەندوقێکی موقەوا چەسپاند بەم چەشنە ئەستەنبولە باقانێکم دروست کرد لە محەلەکە سەیری مندالأنم ئەدا، که دەگەیشتمە سەر ڕەسمی شێخ محمود ئەموت، ئەوە شێری شێرانە مەلیکی کوردستانە) ئاسەف ڕەئووف که خەریکی کاری سیاسی بوو، بۆیە برادەرەکانی بۆلای دەهاتن و پێکەوە بەنهێنی کاری سیاسی یان ئەنجام دەدا، بۆ ئەم مەبەستەش ئاسەف(دڵدار)ی هێناوەتە مەیدانی خەباتەوەو کاری سیاسی پێ کردووە، لەم ڕووەوە دڵدار دەڵێ:- ((شەوێکیان کاکه ئاسەفم منی بانگ کردە ژوورەکەی خۆی پیاوێکی تری لابوو، کەوابێکی شۆڕیان لەبەر کردم جامانەیەکیان لەسەرنام، ئاسەف ووتی لەگەڵ کاك ڕەشید برۆ چیت پێ بڵێ وابکە، منیش ووتم باشە بارانی زۆر بەتاو ئەباری بایەکی بەهێزی ئەهات، چاوچاوی نەئەدیت، من و کاك ڕەشید ڕۆیشتین تا چووینە دەروەی شار لەوێندەر پیاوێکی تر ئینتیزاری دەکردین، هەر سێکمان ئەچین بۆ مالی زاست ئیستخبارات شتێکت ئەدەمێ، تۆ ئەچی لەدەرگا ئەدەیت

خزمـەتكارێكى هينـدى دێتـەدەرەوە، شـتەكەى بـدەرێ و بلـێ ئەمـە بـۆ فەخامەتى مەندوبى سامىيە، گەر پەلامارى دايت بلێ ئاگرە ئـاگر) دواى ئەوە كارەكەم بەجێ گەياندو بۆ ماڵەوە گەڕامەوە ئاسـەف ووتـى مانـدوو نەبى ئيتر هەنارێكى دامىّ و ووتى ئەمەى ئيمشەو بەكەس نەڵێت و ووتم باشە.

(دڵـدار)ى شـاعير سـاڵى ١٩٣٨ لەشـارى كـەركوك دەبێتـە ئەنـدامى (كۆمەڵـەى داركـەر) ئـەم كۆمەڵەيـە لاسـايى كردنـەوەى كۆمەڵـەى كـاريۆ نارى ئيتاڵيا بووە، نورى شاوەيس دەڵـێ (لـە پـايزى ١٩٣٨دا لەبـەر ئـەوەى قوتابخانەى ئامادەيى لەشارى سلێمانى نـەبوو، لەگـەڵ عەبـدوڵلا تۆفيـق جەوهەر چووينە كەركوك من چوومە پـۆلى چـوارەمى ئـەدەبى، لەوێـدا يـەكترمان ناسـى لەوانـە قوتـابى ترمـان ناسـى كەلـە كۆيـەو هـەولێرەوە هاتبوون لەوانە جەلال ئەحمەد بەگ و (دڵدار)ى شاعير (دڵدار) لە ئێمـە گەورەتر بوو لە قسەكردندا زمانى دەگيرا، خۆيان پێ ڕانەئەگيرا دەمانـدا قاقـاى پێكـەنين، تـوڕە نـەدەبوو، لێمـان بێـزار نـەدەبوو، پـاش ماوەيـەك پەيوەنـديمان بـەهێز بـوو بڕيارمانـدا كۆمـەڵێكى سياسـى دامـەزرێنين بـەناوى (كۆمەڵـەى داركـەر)، كۆمەڵـەى دار لقـى لـە هـەولێر و بەغـدا و خانەقين پەيدا كرد، پاش ئەوەى ژمارەيـان زيـادى كـرد، بيرمـان كـردەوە كەناوى كۆمەڵە بگۆڕين لەمانگى نيسانى ١٩٣٩ كۆبوونەوەيەكى فراوانمـان بەست ئەنـدامانى بەغـداو كـەركوك و كۆيـەو سـلێمانى بەشـداربوون، لـە كـەركووك لـە هـوتێلى كۆبووينـەوە، ڕێككـەوتين كـەناوى داركـەر بـە كۆمەڵەى هيوا بگۆڕين، ئەوانەى لـەم كۆبوونەوەيـە بەشـدار بـوون مـن و يونس دڵدار و كاكە حەمەد فازڵ تاڵەبانى و نورالـدين بەهائـەدين بـوون

ئامانجی دوورمان یەکگرتنی پارچەکانی کوردستان بوو بەلام ئامانجی نزیکمان ئیدارەیەکی سەربەخۆ بۆ کوردستان بوو>> [٢]

(دلدار) لە چلەکاندا لە کۆلیژی یاسا لە بەغدا لەگەل مامۆستا مەسعود محەمەد دەبنە هاوڕێ، مامۆستا مەسعود لە گەشتی ژیانمدا بەم جۆرە باسی چلەکانی دلدار دەکات و دەلێ:-

((ئەو سالانەی ١٩٤١-١٩٤٥ کەمن تێیاندا قوتابی حقوق بووم، هەنگاوی چالاکی حیزبی هیوا بوو بە سەرۆکایەتی ئەوسای مامۆستا رەفیق حیلمی، چەند سالێکیان بەر لەوەی لێی بکەونە تەقە بەسەرۆکی بالا ناویان دەبرد، مامۆستا حیلمی بەهرەیەکی گەش و ناسراوی سلێمانی و کوردایەتی و سەقافەت بوو، خۆزیا دوو چاری سیاسەت نەبوایە، دلدار و کاکە حەمەی خانەقای زۆر خۆش دەویست، لەگەل منیش لوتفێکی بێ ئەندازەی نیشان دەدا، گەلێك جار ئەو سێ کەسەمان لەجێگەی وەکو(شەریف حەداد)ی ئەوسای بەغدا لەگەلی دادنیشتین و بۆ ماوەی دوورو درێژ خەریکی دەمەتەقەی هەمە چەشنەی دۆستانە دەبووین کاکە حەمە لەگەل دلدار دۆستێکی بێ فێل بوو هەلی وەردەگرت بۆ دابین کردنی مەیلە یەکجار بەهێزەکەی بۆ نوکتەو گەپ کەدلدار بەدەست زمانەکەیەوە گیری دەخوارد تەنگە تاوی دەکرد، جارێکیان لە (شەریف حەداد) هەلساین بەرەو (باب المعظم) رۆیشتین، کە بامان دایەوە بەدەستە چەپدا بۆ (شارع الرشید) دلدار ویستی پرسیارێك لەمامۆستا رەفیق حیلمی بکات، زمانەکەی گرتی ماوەیێکی لەحەد بەدەر دلدار قسەی بۆ نەهات کاکە حەمەش لەپێکەنینی زیاد کرد، ناوەناوە مامۆستا حیلمی بێ ئەوەی هیچی پێوە دیاربێت ڕووی لەکاکە حەمە

دەکرد بەنەرمە قسە پێی دەگرت حەمە چیتەوە؟ ڕوو پەڕەی سەرۆکایەتی ماموستا حیلمی و هەلگەڕانەوەی ئەندامەکانی لێی تا ئەوەی بەو پەڕی دڵ شکستەیی یەوە وازی لە حیزبکەی هێنا، ئەوەندە شایەدی (دڵدارم) لایە دەیگوت پێوەندیی حیزبایەتی وەهای کرد بێدەنگ بم لەشتی هەڵبەستراو دژی ماموستا رەفیق حلمی)>> (٤)

لەساڵانی ١٩٤٦-١٩٤٧دا (دڵداری) شاعیر دەبێتە ئەندامی حیزبی تحرری الوطني (حیزبی رزگاری نیشتمانی ڕووکارێکی حیزبی شیوعی عیراق بوو حیزبێکی شۆڕشخوازی جەماوەری فراوان بوو هاوڕێ (حسینی محەمەد شەبیبە) ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی عیراق ڕێکخەر و سەرکردەی بوو جموجۆڵ و مەیدانی خەباتی لەمەیدانی هەموو حیزبەکانی دی پترو فراوانتر بوو).

(دڵزار) لەسەر داوای (دڵدار)ی شاعیر دەبێتە ئەندامی پارتی رزگاری نیشتمانی، لەم ڕووەوە دڵزار دەڵێ:- هێشتا مانگێك بەسەر گەڕانەوەم تێنەپەڕی بوو کەلەسەر داوایی یونس رەئووف دڵدار پاش نیوەڕۆیەك عوسمان مستەفا خۆشناو بردمیە ماڵی دڵدار، دڵدار پاش چاك و چۆنیەکی گەرم بەکاك ئاسەفی براگەورەی ناساندم و پێی گووت ئەمە دڵزارە، کاتێکی خۆشمان لەگەڵ دڵدار و کاك ئاسەف بەسەر برد لەو ڕۆژەدا لەگەڵ دڵدار بووینە هاوڕێ و دوو هاوبیر، زۆر هانی دەدام، کە شیعرەکانم لە گۆڤاری گەلاوێژ بلاوبکەمەوە، لەشاری کۆیە کۆمەڵی کاروباری سیاسیم لەگەڵ دڵداری شاعیر بە ئەنجام گەیاندووە، لەم بارەیەوە دڵزار دەڵێ:- (لە ڕۆژی ١٩٤٨دا گەورەترین ئاهەنگمان گێڕا، یونس رەئووف (دڵدار) و من بەیەکەوە بەڕەسمی ئیجازەی نەورۆزمان لە

قائیمقـامی کۆیـه وەرگـرت کـه ئەوسا (صـبحی علـی)بـوو، لەبـەفری قەندییان شوێنمان خۆش کردو شانۆیەکی زۆر ڕێك و پێکمان پێکهێنا زۆربەی زۆری جەماوەری کۆیه بەپیاو و ژنـەوە بـه قائیمقـام و پیـاوانی میری و ئاینیشەوە بەشدارییان تێدا کرد>>[5]


سەرچاوەکان

١. عبدالخالق علاءالدین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد چاپخانەی دار افاق عربیه، بەغداد ١٩٨٥، ل٣٤ - ٣٥.

٢. ئەحمەد خواجه، چیم دی، چاپخانەی راپەڕین سلێمانی ، ل٢٨ - ٣٠.

٣. نوری شاوەیس، مـذکراتي، مـن منشورات حـزب الشعب الـدیمقراطي الکردستاني ، ١٩٨٥، ل٢١.

٤. مەسعود محەمەد گەشتی ژیانم، چاپی ستوکهۆڵم، ١٩٩٢، ل٢٣٧.

٥. ئەحمـەد دڵـزار ، بیرەوەری ڕۆژانـی ژیـانم چـاپخانەی بنکـەی سـارا، ستوکهۆڵم، ١٩٩١، ل٧١-٧٤.


## فۆلکلۆرناسی کورد محەمەد تۆفیق وردی

مامۆسـتا محەمــەد تۆفیــق وردی لــەژیانی رۆژانەیـدا بــەردەوام لەخــەبات و کۆشــش کردنــا درێغـی نــەکردووە، لــەبواری کوردایــەتیو نیشـتمانپەروەریدا وەك مرۆڤێکـی ماندوونــەناس و جەسـور رۆڵێکـی بەرچاوی نەخشاندووە، بەتایبـەتی هـەڵگری بیروبـاوەڕی زەحمەتکێشان

بووە و لەپێناویاندا تووشی گرتن و بێ کاری و ناوخۆشیەکی یەکجار زۆر بۆتـەوە لەگـەڵ ئەوەشـدا کـۆڵی نـەداوە بێوچـان لەتێکۆشـاندا لـەریزی پێشەوە دەبینرێت لـەتێزی دکتۆراکەمـدا کـە بـەزمانی فەرەنسـی‌یە بـەم شێوەیە باسی محەمـەد تۆفیـق وردی)م کردووەسـاڵی ١٩٢٢-١٩٧٥ لەشاری کۆیـە هاتۆتـە دنیـاوە، خوێنـدنی لـەئامۆگای مامۆسـتایانی بەغـدا تـەواو کردووە، ساڵی ١٩٤٤ لەکۆیە بۆتە مامۆستا، چالاکی لەگەڵ رێکخراوی هیـوا نواندوە پاشان چۆتە پاڵ کۆمەڵەی (ژ.ك)لە کوردستانی ئێران، بەشداری کۆماری مهابادی کردووە، بەرپرسیاری دەزگای چاپ و بلاَوکردنەوە بووە، پـاش کودەتـای ١٩٥٨ گەڕاوەتـەوە بەغـداو لـەبواری خوێنـدن و پەروەردەکاری کردووە، کۆمەڵێ نوسراوی بەنرخی لـەدوای خـۆی بـەجێ هێشتووە لەبواری جیاجیادا شوێن پەنجەی دیارە، کتێبی لەبارەی شـیعرو کورد و فۆلکلۆری کـوردی نووسـیوە، بەتایبـەتی لەوەرگێڕانـدا شـوێنێکی گرنگی هەیە، بەرهـەمی لـەزمانی عـەرەبی و فارسـی‌یەوە بـۆ سـەرزمانی کـوردی وەرگێـڕاوە، هـەروەها بەرهـەمی کـوردی و فارسـی بەعـەرەب ناساندووە[1].

ئەحمـەد دڵـزار لـە بـیرەوەری ژیانیـدا دەڵێ:- لـە پـایزی ١٩٤٤دا لـە عەسـکەرییەوە بەسـەردان چووبوومەوە کۆیـە هـاوڕێ و دۆسـتی نـەمرم محەمەد تۆفیق وردی داوای دەفتەرەکەی لێکردم کەماوەیـەك لـەلای بێـو لەگـەڵ چـەند هەڵبەسـتێکی شـاعیرە هاوچـەرخەکاندا چاپیان بکـات جا لـەپایزی ١٩٤٥دا (وردی)فـەرمانی مـیری بـەجێ دێڵـێ کەمامۆسـتای قوتابخانەی سـەرەتاییەکەی تـەق تـەق دەبـێ، خـۆی دەگەیەنێنـە مهابـاد، کـەدوایی بـوو بـە پایتـەختی کۆمـاری دیمـوکراتی کوردسـتان و دەفتەرەکەشـی لەگـەڵ کەلوپـەلی خۆیـا دەبـا و دوای کـەوتنی کۆمارەکـە

کۆرپەکەی مهاباد[٢]، دەفتەکەرەی منیش بەهەموو شیعرەکانمەوە لەناوچوو.

ئەحمەد دڵزار لەبارەی پەیوەندی خۆی بە(وردی) شاعیر و نووسەرەوە بەردەوام دەبێ و دەڵێ:- لەنەورۆزی ساڵی ١٩٤٨ گەورەترین ئاهەنگمان گێڕا، زۆربەی جەماوەری کۆیە بەپیاو و ژنەوە بە قایمقام و پیاوانی میری‌و ئایینەوە بەشداریان تێداکرد، سێ شانۆگەری تێدا پێشاندرا پەیمانی پۆرتسمۆس و دەمەتەقێکی کرێکار و جووتیارێک گەمن بە شیعر نووسیبووم لەگەڵ هاوڕێی نەمرمحەمەد تۆفیق وردی پێشکەشمان کرد من دەوری کرێکار و ئەو هی جووتیاری دەگێڕا.[٢]

نەورۆز کە رەمزی سەرکەوتن و مانەوەی کورد پیشان دەدات، لەهەمان کاتدا جەژنی نەتەوەیی کوردەو مۆرکی کوردی پێوە دیارەو شاعیرانی کوردیش لەیادی ئەم جەژنە پیرۆزەدا گەلێ هۆنراوەی جوانیان بۆ هۆنیوەتەوە لەم بارەیەوە محەمەد تۆفیق وردی شاعیر دەڵێت:-

ئەو خاکە کوردستانە<br>
بۆیە واشەنگ و جوانە<br>
جێی فریشتەی جەناتە<br>
بۆن خۆش گوڵ و رەیحانە<br>
نەورۆز بەرەنگی سورت<br>
بەئاگر و گوڵ ونوورت<br>
بەوێنەی دوو سەد جۆرت<br>
بەو کاوە قارەمانە<br>
یادت بکەین هەموو ساڵێ<br>
ژینمان خۆش بێ وەیا تاڵ

دانێین گیان و سەرو ماڵ

لەڕێی ئەو نیشتمانە

ئازادی خاکی ڕەنگین

بەخوێنە، نەك بە ئەسرین

تا نەمری نابینی ژین

ئەوە پەندی زەمانە

جا لە خاکی کوردستان

مەڵبەندی شێر و مەردان

ئەبێتە جەژنی جەژنان

زۆر نەما بەم زووانە[٤]

محەمەد تۆفیق وردی زیاتر وەك کەلەپوورناسێك ناسراوە، ڕۆڵێکی دیاری بینوە لەپەرەپێدان و پێشخستنی سامانی ئەدەبی فۆلکلۆریمان لەم بوارەدا شوێنی لەڕیزی پێشەوەی خزمەت گوزارانی فۆلکلۆر و سامانی نەتەوایەتی مان دێت، وردی گەلێ دەقی ئەدەبی فۆلکلۆری لەفەوتان و لەناوچوون رزگار کرد، بەتایبەتی ئەو ماوەیەی کە لە کوردستانی ئێران بوو، توانی بە هەندێ لە کوردەکانی سۆڤیەت و باکۆ بگات و بەرهەمە فۆلکلۆریەکانیان لەگەڵ خۆیدا بهێنێتەوە کوردستانی باشوورو دوای ساغ کردنەوەیان بەچاپیان بگەیەنێ.

بەدەیان بەرهەمی فۆلکلۆری کۆکردەوەو بەچاپی گەیاندون وەکو (حەسەن و مریەم) و (خانزاند و لەشکر)(ناسر و مارمار)، (مامە یارە قارەمانێکی بەناوبانگی کورد)(قەڵای دمدم)(فۆلکلۆری بەشی یەکەم و دووەم و سێ یەم)(بەیتەکانی عەلی بەردەشانی) بەزمانی عەرەبیش هەر لەم مەیدانەدا ئەم بەرهەمانەی بڵاوکردونەتەوە(اقاصیص شعبية

کردیـه)(دراسـه في الفلکلـور الکـردی). (نمـاذج مـن الـتراث الشـعبي الکردي)،(نوروز و ثورة کاوه الحداد)(قصص شعرية کردية فلکلورية)بـه‌م جـۆره که‌رده‌سـته‌یه‌کی بـه‌پێزی له‌شـیعر و چیرۆکی فۆلکلـۆری خسـتۆته به‌رچـاوی خوێنـه‌وارو سـوودێکی به‌کـه‌ڵك بـه‌و که‌سـانه‌ی ده‌گه‌یـه‌نێ که‌لـه‌ده‌قی فۆلکلـۆری ده‌کۆڵنـه‌وه، بـه‌ده‌یان به‌رهـه‌می تـری خۆمـاڵی و وه‌رگێڕانی چاپ کردوون که‌ژماره‌ی به‌رهه‌مه‌کانی نزیکه‌ی (٤٦)به‌رهه‌می هه‌مه‌ره‌نگه، به‌مه‌ش خزمه‌تێکی گه‌وره‌ی بۆ پایانی بزوتنـه‌وه‌ی ئـه‌ده‌بی رۆشنبیری کوردی‌و کتێبخانه‌ی کوردی زه‌نگین و ڕه‌نگین کردووه.

### سه‌رچاوه‌کانی ئه‌م باسه


١. که‌مال مه‌عروف ، بزوتنه‌وه‌ی نوێخوازی لـه شـیعری نـوێی کوردیـدا، به‌زمانی فه‌ره‌نسی، زانکۆی پاریس ١٩٩٠.

٢. ئه‌حمه‌د دڵزار بیره‌وه‌ری رۆژانی ژیانم ، ستوکهۆڵم ١٩٩١، ل٤٤.

٣. هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل٧٤.

٤. محمد توفیق وردی، بانگی کوردستان، به‌غدا، ١٩٧٠،ل٣١.


* * *

## بانگی ئازادی له‌شیعره‌کانی سامی عه‌وداڵدا

سامی عـه‌وداڵی شـاعیر وه‌ك شاعیرێکی پێشکه‌وتنخوازو شۆڕشگێڕ پێـی وایـه کـه هـیچ میلله‌تێك ئـازادو سـه‌ربه‌خۆ نابێ، ئه‌گـه‌ر لاوه‌کـانی نه‌بنـه قۆچـی قوربـانی شـۆڕش، بۆیـه له‌به‌شـێکی شـیعره‌کانی‌دا جـه‌خت له‌سه‌ر ئـه‌وه ده‌کـات کـه ده‌بـێ پشـت بـه لاوه‌کـانی کوردستان ببه‌سترێ‌و ئامـاده‌بکرێن بـۆ خـه‌بات‌و تێکۆشـان، دیـاره له‌هـه‌موو شۆڕشـه‌کانی

کوردستانیشدا، هەردەم لاوان سوتەمەنی شۆڕش بوون، لەڕیزی پێشەوە جەنگاون، جا پێویستە ئەم هێزە گەورەیە، کە سەربەچینێکی دیاریکراوی کۆمەڵ نین بەگیانی فیداکاری گۆش بکرێن‌و سوود لەوزەو توانایان وەربگیرێ بەتایبەتی لەقۆناغی ڕزگاری نەتەوەییدا. (ماوتسی تۆنگ) لەشۆڕشی ڕۆشنبیریدا بایەخێکی بێ پایانی بەلاوان‌و خوێندکاران، بەجۆرێ ڕۆڵ‌و سروشتی لاوانی شیکردەوە، هەروەها شێوازو پێداویستییەکانی بۆ دابین کردن تاکو لەبنیادی ئیشتراکیەتدا سوودمەندبن. هەروەکو ئاشکرایە داگیرکەرانی کوردستان وەك دڕندەن بەشێوازی ئاشتی سەر بۆ داخوازییەکانی کورد دانانوێنن، بۆیە تاکە ڕێگای سەرفرازی هەر بەخوێن ڕشتنە، کە دوژمنان ناچار دەکات کە پێیان خۆشبێ‌و پێیان ناخۆش بێ دەبێ دان بە بوونی گەلی کورد دابنێن‌و ئەمەش ڕاستییەکە کە بیری پێشکەوتنخواز سەلماندویەتی.

سامی عەودالی شاعیریش لەم ڕووەوە دەڵێ:

لاوی کورد قوربانی دەربێ سەیرەکێ بەرپێدەکا
کاتی تاریك بوون لەڕێی گەل وەك چرا خۆی پێدەکا
ڕۆڵە ڕێی ئازادی میللەت خوێن دێ پرسی پێدەکا
پێی دەڵێ من ئاوی داری حورو ئازادیمە هەر
شین بکەم لەو نیشتمانەی بۆ هەژاران بێتە بەر
داری ئاوبدرێ بەخوێنی بێشکە هەر بەردەدا
هەر بەخوێنە دوژمنی گەل دەست لەخاکت بەردەدا
فاشی دێ گەر خوێن نەڕێژێ ئاگرت تێبەردەدا
خوێن‌و تێکۆشان نەبێ لات دەبیە ڕوت‌و دەربەدەر

فـەرقـی کـانـێ نێـرومـێ شێـر لـەلانی بێتـەدەر
خـوێنـی سوورت گەر نەڕێژی یالە بەندو هەندەران
دەبیـە عـەبدی خوێن مژان‌و دیلی دەستی نۆکەران
جـا بـەهێـزو خوێنی سورت هەروە شاخ‌و سەنگەران
ببیـە لاوێکی بـەسـام بـۆ کوردی مـەردی پڕ هونەر
بـۆ هـەژاران خوێن بـڕێـژە تـاجـی ژینـت بێتـەسـەر

جارێکی تر ڕۆڵی لاوان‌و کۆششی بێ وچانیان لـەپێناوی هێنانـەدی ئازادی‌و سەربەخۆیی دەخاتە ڕوو، دەری دەخا کە هەر بەخوێنـە ئـازادی بەردەگری‌و سەربەستی دێتە دی.

مـن خـۆشـی ژیـنـم نـاوێ یـا سێدارەو گۆڕستان
یـان سـەربـەخۆیی بۆ گەل‌و کۆمارێکی کوردستان
نیشتمانێکـی حـوڕو میللـەتێکـی سـەربـەخـۆ
بـەخوێنی ئەو لاوانەی بەخوێن ڕژاندن هەستان
بـەگیـانـی ئـەو لاوانـەی لـەسێـدارە دراون
لـەنـاو کـۆت‌و زنجیـرو بـەنـدی بێ‌گانان ماون
مێـژوو نـاویـان دەنـوسێ لـەهـاتی پاشەڕۆژێ
گـاز دەکا ئەی شەهیدان ئێستا زیندونەو ماون
بـەخوێنی ئـەو لاوانـەی خـوێنی سوریان ڕژاوە
بـۆ مـافـی میللـەتـی کـورد لـەسێـدارە دراوە
گیـانـی وا پـاسـەوانـەو خوێن بۆ داری ئازادی
داری ئـازادی ڕوانـد لـەبـنـچی خـۆی ژیـاوە
سەت شوکر باس دەکرێ لەناو ئێزگەی هەندەران

دڵی دوژمن دەژێنێ بەکرێگیراوو نۆکەران
لەترسی پێشمەرگەی کورد وەکو مامز ڕادەکەن
دنیای لێکردن بەپەند سامی خاوەن هونەران

شاعیر خەڵکی کوردستان هۆشیار دەکاتەوە کە لەخاوو سستیو تەمبەڵیو ناکۆکیو ناتەبایی دوورکەونەوە چونکە داگیرکەران بەزەبری کوتەك نەبێ سەر بۆ مافی ڕەوای گەلی کورد شۆڕناکەن، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ شێلگێرانەو شۆڕشگێڕانە ڕێگای خوێناوی بگرنەبەر تاکو ئاڵای ئازادی هەڵدەکەن.

سەر بەرزکەن چاو هەڵێنن بەخوا مافمان نادەنێ
وابەسستیو دەم دەمانێ ڕێگە دوورەو نایگەنێ
ئەوکەسە ڕاستە دەڵێ حەق مەردە بێ ترسو نەبەز
وەك لەڕێگای نیشتماندا گیانی شیرن دادەنێ
ڕۆژو شەو دایم خەریکی ڕێزو چینی میللەتە
کفنی خوێنین کاتە بەرخۆ بەرگی دیلی داکەنێ
وەك پڵنگی شاخی کوردان دوژمنی کورد ڕاودەنێ
چەنگی پۆڵایی لەجەرگی خوێن مژو پاشا دەنێ
هەروەکو کاوەی دلێرو ڕۆستەمی مازەندەران
تاجی زێری خوێن مژانو تەختی زوڵمی ڕاقەنێ
سامی وەك سامی نەریمان شاودلێری سەرزەمین
خوێن دەڕێژێ سەربەخۆیی خوێن نەبێ گوێنادەنێ

تێبینی: شیعرەکان لەئەرشیفی بەندە وەرگیراون و بۆ یەکەم جار بڵاودەکرێنەوە

## شیعرە سیاسیەکانی سامی عەودالی شاعیر (١٩١٠ - ١٩٨٥)

ساڵی ١٩٨٣ ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان چەپکێك لە شیعرەکانی سامی عەودالی بەچاپ گەیاند کەهەندێ شیعری کۆمەڵایەتی و نیشتمانی و دڵداری بەخۆوە گرتوون، بەڵام شیعرە سیاسی‌یەکانی تێدا بڵاونەکراونەتەوە، جا منیش وەك یاد کردنەوەیەکی شاعیر بەشێك لە شیعرە سیاسیەکانی دەخەمە بەردیدی خوێنەرانی (هاموون) بەهیوای ئەوەی لە داهاتوودا تیشکی زیاتر بخەینە سەر شیعرەکان.

سامی عەودالْ بە هۆنراوەی (قەلبی من)، (ناوبانگی دەرکردووە، هەر چەندە کاتی خۆی مامۆستا کەمال غەمبار، ئامـاژەی بـەوە کردبوو، کە ئەم هۆنراوەی لەژێر کاریگەری شیعرێکی نازم حیکمەت هۆنیوەتەوە، منیش هەمان باوەڕم هەبوو، بەلاّم کە لەگەڵ سامی عەودالّی شاعیر قسەم کرد، سامی عەودالْ نکۆڵی لیّ دەکرد و دەیووت بەهیچ شێوەیەك شیعرەکانی نازم حیکمەتی شاعیرم نەدیووەو نەبیستووە، بەهەر حالْ شیعرەکە یەکێکە لە شیعرە هەرە ناسك و جوانەکانی شاعیر، چ لە ڕووی ناوەرۆکی پێشکەوتنخوازییەوە بیّ یاخود لە ڕووی تەکنیك و هونەری شیعرییەوە بێت.

بەشاکارێکی شیعری داهێنەر دادەنرێت کە لەلایەن هونەرمەند (تاهیر تۆفیق)ەوە کراوە بە گۆرانی:-

شیعرەکەش بەم جۆرە دەست پیّ دەکات:-

قەلبی من گەر چەشنی لالە بێتوو نەوتی تیّ بکەن
ئاگری دوژمن بێتە گیانم وەك چرا من پیّ بکەن
شەق شەقی کەن گۆشت و ئێسقان یەك بەیەك خوێی تیّ بکەن
بیّ ترس من دێمە مەیدان حوکمە ئازادیم دەویّ
گەر نەسووتێم و نەخنکێم چۆن هەزارم سەرکەویّ
نەچمە ناو جەرگی هەژاران شان بە شانی وەك برا
ڕۆح و لاشەم ئیش نەکەن بۆ میللەتێکی حەق خورا
بەو شەوی پڕ ترس و تاریك من نەسووتێم وەك چرا
کۆمەڵی زانای هەژاران چۆن دەبینین بچنە پێش؟
لێم گەڕێن من بابسووتێم ببمە خاك و خۆڵەمێش

ببمه خاكو خۆڵەمێش تاكو هەژارم پێبگا
بابسووتێم بەلکە گەنج و لاوەکانم تێبگا
بێتە مەیدان خوێن برێژێ تا هەقی خۆیی پێبگا
تابزانێ غەرقی خوێنە کێ هەقی وی خواردووە؟
با لەبۆ هەق خوێن برێژێ دەرچێ دوژمن تا زووە
با لەناو میللەت نەمێنێ فیکری ئینسانی دەنی
نەك لەناو مێشك بمێنێ ببتە ماددەی بۆگەنی
شەعبی چاکی پێ نەخۆش بێ بێتە حاڵی مردەنی
خۆشە مردن بۆبەڵای وا هیچ و پووچ و پڕ خەتەر
نەك بژی ئاقل بەبرسی و ڕووت و قووت و دەردیسەر
سامی قوربانی گەلت بەقەت مەژی بەو زیللەتە
هەرکەسێ بمرێ لەڕێگای نیشتمان و میللەتا
نامرێ هەرگیز دەمێنێ چونکە خاوەن غیرەتە
خۆت بەقوربانی گەلت کەفەرزە قوربانی لەتۆ
نیشتمانی حورو سەربەست ئوممەتێکی سەربەخۆ

شیعرێکی تری بەناوی (گلەیی نیشتمان) هەیە کە شاعیر مەسەلەی نەتەوایەتی و چینایەتی پێکەوە ئاوێتە دەکات، تیشک دەخاتە سەر ئەوەی ئەگەر چەوساوەکان ڕانەپەڕن و تێ نەکۆشن، نیشتمان هەر چەندە پڕ بەهاو بەنرخ بێت، هەر بەغەمباری و ژێر دەستی دەمێنێتەوە.

ئەی وەتەن تۆچی لە بۆمن خۆشو شادی چیت هەیە
باغی پڕ گوڵ دەنگی بولبول سازی فردەوسیت هەیە

هەندێ ئەرزی نێرگزین و سونبول و هەم یاسەمین
باسی ناکرێ گوڵ لەکێوان خاوو نەسرینت هەیە
سێومرەو وێنجەی شلێر و حاجیلە و ڕەیحانی دەشت
مەندیلانەو نەوعی هێرۆ بۆنی بەیبونت هەیە
ڕۆنی سپیان گەنمی یەك تۆ برنجی عەنبەر زۆرە خۆ
مێوژو دۆشاوت بە زۆری ڕاوی هەنگوینت هەیە
خۆخ و هەنار و ناسکە هەرمێ هەم هەڵوژە هەم گەلاز
باغی پڕ میوەو تەعامو سێوی نەخشینت هەیە
سێبەری گوێز و چنار و ئاوی کانی وشەنگەبیت
جا بەمن چی تۆ پەنیر و ئاوی بەفرینت هەیە
ئاوی گەڕاوی کۆرەکانیت توکی سەرمی هەڵومراند
هێشتا ناڵێم ئەی وەتەن تۆ سوچو تاوانت هەیە
تیپی کارگەر ئاشی ئازادی نەگێرێ گەر بەخوێن
بێ سەرو پا هەر دەناڵی خاکی غەمگینت هەیە
سام و هێزی کارگەرانە بویتە کۆمۆنەی فەرەنگ
قارەکان هەر پێنج دەڵێن تۆ نەجمەی خوێنینت هەیە

شاعیر لەبەر نەهامەتی و نەبوونی، نازانێ سەری خۆی بۆ کوێ هەڵ گرێ و ڕوو لە کوێ بکات.

نەخۆشخانەی هەژاری پێم بڵێن لە کێندەرە
لە واشنتۆن و پاریس یا بچمە ئینگلترە
لە پەکین و مۆسکۆیە یا لە ڕۆماو ئەسینا
یان لەبیری ڕۆناك و مێشك و هۆدەی سەرە

بەم جۆرە خاڵە سامی سەردەنێتەوە، بەچاوی خۆی کوردستانی ئازاد نابینێ بۆیە دەڵێت:-

هەتا دەبمەوە خۆڵەکەی جاران
لەلاشەم دەردێ گوڵی بەهاران
دێن لە بۆ سەرم لە بۆ گوڵ چنین
هەر دەڵێم ماف و مافی هەژاران.

★ ★ ★

## سامی عەوداڵ دەنگی چەوساوەکانە

سامی عەودال وەکو شاعیرێکی گەلی و عاشقی ئازادی و سەرفرازی لەبناری هەیبەت سوڵتان و کە کۆندا، چاوی بەدونیادا رۆشن کردەوە. شیعرە ئاگرینەکانی حاجی قادری نەمر و دلداری تێکۆشەر هەوێن و سەرمەشقی بوونە، هەرکە چاوی هەڵهێناوە، شانۆی ناکۆکیەکانی دەرەبەگ و جووتیاری ناوچەی کۆیەی بینیوە، کە چۆن ئاغاکان و دارو دەستەکانیان، غەدر و زۆرداری لە جووتیارە هەژارەکان دەکەن و دەیان چەوسێنەوەو

بێکاریان پێ دەکەن، سەرەڕای ئەو هەموو ماندوبوون و ئارەق ڕەشتنە، کەچی لە بچووکترین مافی مرۆڤایەتی بێ بەشیان دەکەن، بەجۆرێ کەنانە ڕەقەیەکیان پێ‌ڕەوا نابینن، شاعیر دەنگی نارەزایی بەرەو ڕوویان بەرز دەکاتەوە، دەنگی خۆی دەخاتە پاڵ دەنگی جووتیاران و هانیان دەدات بۆ خەبات و تێکۆشان لەدژی چەوسێنەران دا.

جا بزانین لەدەمە تەقەی نێوان دەوڵەمەند و هەژاردا چیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

کارکەر: فەقیر

کارکەر دەڵێ دەوڵەمەند منم دەست بەخەنجەرم
ڕۆژ و شەو لە چۆلان و لەچوار فەسلان ڕەنجبەرم
بۆچی ئەمن هەژار و تۆ خاوەنی قەلاتی
کەچی تۆ ترسنۆکی و منیش خاوەن هونەرم

دەوڵەمەند:-

ئەی هەژاری هیچ نەزان من هەڵبژاردەی خوامە
هەرچی من گوتم بڵێ بەسەرچاو و سەرسەرم
خوا بۆی دابەشکردینە بۆ تۆ کەم و بۆ من زۆر
بەشی تۆ بەرهەتاوە من لەسایەی سێبەرم

فەقیر:-

تۆ دوژمنی یەزدانی، خوێن مژی چینی هەژار
هەر من پیادەمە بۆ گەل بۆم هێناوە و دەیبەرم
پێویستی نامەی مێژووی خوری و ئاوریشمی خاوی
هەر چەند بێ کەلاش و بێ ڕانکو بێ چۆغەرم

دەوڵەمەند:-

مـن خـاوەنـی دۆلارم لـەنـاو کۆشك و تەلارم

تـۆ ئـاوم لـە دەستی کـە ببە کۆیلەو نۆکەرم

خـوا ئێمـەی هـەڵبژاردو وازیشمان لێ ناهێنێ

خۆشەویستی یەزدان و پەیڕەوی پێغەمبەرم

فەقیر:-

دەمـت ببەسـتـە ئـەتـۆ دۆلار پـەرستـی نـەزان

مـافـت هـەر لـێ دەستێنم کارگەری جەنگاوەرم

چاوی کوێرت لەمن بێ غەرقی ناو خاکت دەکەم

منم نیشانـەی شەستیر سار ئەکەم گوللەی گەرم

لـەڕێـی ژیـانـی هاوبەشی و نەمانی داگیرکەران

خوێن دەڕێژم بەبێ سام وا لە شاخ و سەنگەرم

لـەهۆنراوەی (درۆناکـەم) شـاعیر ئامـاژە بـە نـرخ و بـەهای سروشـت و دیاردەکـانی دەکـات و خۆشەویسـتی و وەفـایی خـۆی بـۆ نیشـتمان و گەلەکەی دەخاتە ڕوو:-

لاشەکەی من گەر لە ڕێی تۆ لەت لەت و سەتپارەکەن

گـەردەنـم لێدەن بـە شـەستـیـر یا پەتی سێدارەکەن

ئـاگـریـش بـەردەن لـەلاشـەم چۆن دەتانن چارەکەن

مـن لـەتـۆ زویـر و وەڕس کـەن دوژمنـانـی نـابەکار

بـۆ دزیـنـی ئـاوی شـاخ و گـەوهـەری ناو بەرد و دار

گـەوهـەری نـاو بـەردودارت حـەسـرەتی بێگـانـەیە

بەڵکە سەت ساڵە لە داخی ئاوی ئەو شاخانەیە
چونکە برسی نەوتی خام و سەروەت و سامانەیە
وا سەدان ساڵە لەخاکی کوردی خڕ کردیتەوە
هەر دەڵێی کتکە کە ئێستاش چاوی بزکردیتەوە
لەو خاکە پاکەی گەوهەرین و پڕ درەختی میوەکان
خۆشەویستی دین و دنیا گیانی گشتی چینەکان
هەر کە فیردۆسی جیهانە خاکی کورد و نیشتمان
گەوهەر مۆژدەو خەڵاتی ولە هەلگۆش دێتە خوار
حۆریەکانی خاکی شادی جوانی ناگۆترێ بەزار
خاکی کوردی پڕ لە زێڕو ئاوەدانی پڕ لەدان
وادەچێ بۆ دوژمنی کورد خوێن قرانی هەندەران
غیرەتە ئەی لاوی کوردان بۆ گەنی بوون بیرەکان
هەستە بۆیەك بوونی خاکت سەربەخۆیی میللەتت
هەر خەباتی خوێن ڕژانە ببتە قەدر و قیمەتت
هەستە ئەی کورد خوێن بڕێژە ڕۆژ لەخۆت ئاوامەکە
نادرێ ماف خوێن نەڕێژی خوێن نەدەی داوا مەکە
وەختی ئازادیت نەدۆڕێ کاری خۆت ساوامەکە
هەر چی ئیمڕۆی دا بە دوێنێ ڕووت و برسی مایتەوە
ڕووی ڕەشە وەك پشتی قاز و خیرەتی تاوایتەوە
کەند و شاخی خاو گیابەند دامەنی ئاوو هەوای
فێنك و تەڕ ناو قەدیشی باغی نەمردو سەبای
دێمەکاری جەنەتولخولد بوو جەزای ڕۆژی خودای
خاکی کوردە جوانی یەزدان پڕ لە ژین و ژینەوەی

مـافی مێژووی سەربەخۆیی حورو سەربەستی ئەوەی
میـدیـاوکـەی سـەلام شێـخ سـەعید و میـروشـای
بـابـروخـێ دوژمنـانـی نـاحـەزانـی بـێ وەفـای
کەوتنە لەرزەو سامی هێزی توند و تیژ و پڕ جەفـای
کـوردی مـەردی سـەر بلـند و لاوی ژیـری مێـژووزان
بـا لـە گـوێیدا رەقیـب و دوژمنـانـی هیچ نـەزان

شاعیر پاش ئەوەی ژیانی تاڵ و تفتی جووتیارانی کوردستان پیشان دەدات بیر لە هەڵبژاردنی ڕێگایەکی ڕاستەقینە دەکاتەوە کە بەهۆیەوە جووتیـاران هۆشـیار بکاتـەوە لـە زوڵـم و زۆرداری دەرەبـەگ و توجـاری چاوچـنۆك، ئـەو ڕێگایـەش ڕێـگـای سۆشـیالتیيە. کەتاکـە ڕێگایـە چەوسـاوەکان لـە زەبـر و زەنـگ رزگـار بکـات و پەنجـە بخاتـە سـەر زامـەکانیان و تیمـاری دەردەکانیـان بکـات، مـژدەی سـەرکەوتنیان پـێ ببەخشـێ و ڕوونـی بکاتـەوە کـە زۆردار و چەوسـێنەر رۆژی رەشـیان نزیکەو تا سەر ناتوانن لـە زۆرداری بـەردەوام بن، جا شاعیر بـە زمانی جوتیاران هەست و سۆزی خـۆی دەربڕیوە شاعیر بـە زمـانێکی سـاکار و سادە کێشـەکان دەخاتـە ڕوو، دەری دەخـات کـە مەسـەلەی جووتیـارن لـە بناغـەدا مەسـەلەی نەتەوایەتییـە، بۆیـە بەشـێکی زۆری شـیعرەکانی بـۆ ڕەش و ڕووتی میللەتەکەی داناوە، لەهۆنراوەی (ئەمن)دا دەڵێ:-

بـەچکـە کـوردێکـم لـە کـوردی عیراق
وەك مار پێچ دەخۆم کوشتومی مەراق
لـەنـاو وەتـەن و قـەومیـەتـی خـۆم
حیلفـی پـۆتسـدام بـە خوێنی دەشۆم
بـاخچـەو بـەراوی وەك گـوڵزارەکەی

جووتیار و رەنجبەر زەوی و زارەکەی
کە رۆژ لێی دەدا لەو ئەرزی رەنگین
لەمیوەی تەڕی و گوڵی یاسەمین
مەدحی پێ ناوێ خۆڵاسەی کەلام
بڵێین جەنەتە وەك دار و سەلام
کە هاتیتە بەر بەرەنجی هەژار
زەوتیان کرد بەخوێن مژ و زۆردار
ئەو خائینانەی دڵ پیس و غەدار
دەیکەن بە پار و لوقمەی ئیستعمار
ئازادی دەکەین هەر بەخوێنی گەش
سەری خائینان دەنێینە ناو هەش
ئەوا ئازادی خوا غەمی دەنۆشن
بۆتۆ ئەی وەتەن گەلێ بە جۆشن
ترسیان نییە لە گوللە باران
لەسەر ئەساسە رێگای هەزاران
ئێمە کە کوردین لەگەڵ براکان
هەزاری هیندیو ئەنگلۆ ئەمریکان
غایەمان یەکەو خەباتیش بەپێ
بەیەك عائیلە ئەدیترێن بەبێ
شك و گومانتان وەهابێ وەهان
ڕەوڕەوەی مێژوو دەروا بێ وچان
هەتا قۆناغی بێ تەبەقاتە
لەوێ حەل دەبێ جێگای وەفاتە

قـۆنـاغـی پـێـنـجـه غـایـه‌ی سامـی‌یـه
لــــه‌گـشـت ئـه‌رزی پــڕ ئـارامـــی‌یـــه
له کۆتاییدا ده‌گه‌ینه ئه‌و ئه‌نجامه‌ی که شاعیر به‌ته‌نگ چه‌وساوه‌کانه‌وه هاتووه، هه‌وڵی داوه که وریایان بکاته‌وه تاکو له زۆرداری رزگاریان بێ له‌هه‌مان کاتدا به‌بیری پێشکه‌وتنخواز خۆیان چه‌کدار بکه‌ن.
چونکه تاکه رێگایه که چاره‌سه‌ری برینه‌کانیان بکات و ئاشتی و ئازادی بهێنێته دی.
تێبینی : شیعره‌کان له ئه‌رشیفی به‌نده وه‌رگیراون.

★ ★ ★

## رۆستەم حەوێزی شاعیر و دوو قەسیدەی تەخمیس کراو

شیعره‌کانی رۆسته‌م سه‌ر به قوتابخانه‌ی ئه‌ده‌بی کلاسیکی نوێیه، که‌به‌بزوتنه‌وه‌ی ته‌نویری داده‌نرێت، ئه‌م شه‌پۆڵه ئه‌ده‌بی‌یه، رووخساری هونه‌ری به قوربانی بیری سیاسی ده‌کات ئه‌وه‌ی لێره‌دا مه‌به‌ستمانه، ته‌نیا خستنه رووی دوو قه‌سیده‌ی ته‌خمیس کراوی شاعیره، یه‌کێکیان شیعری تاهیر به‌گی جافه به‌ناوی ( تا به‌که‌ی قوربان)، ئه‌ویدیکه‌یان هی

مستەفا بەگی کوردیيە، بەناوی (ئەمان مردم)، کە شاعیر هەردوو شیعری بەدڵ بووەو هاتووە، کردونیەتی بە پێنج خشتەکی.

پێنج خشتەکی: هونەرێکە لەشیعری کلاسیکیدا پەیڕەوکراوە، بەشێکی زۆر لەشاعیرانی کلاسیکی لەم جۆرە شیعرانەیان نووسیون، کاتێ شاعیرێك بەشیعری شاعیرێکی دی سەرسام بووە، دوو دێڕی شیعرەکەی وەرگرتووە، سێ دێڕی خۆی خستۆتە سەری، لە رووی کێشەوە هەموو کۆپلەکان لەسەر یەك کێش دەبن، بەگوێرەی سەرواوە، کۆپلەی یەکەمی قەسیدەکە هەموو یەك سەروای دەبێ، کۆپلەکانی دی تەنیا دێڕی پێنجەم لەهەر کۆپلەیەکدا لەگەڵ سەروای کۆپلەی یەکەم یەکدەگرنەوە، کە بەم شێوە دەبێت ا ا ا ا ا ، ب ب ب ب ا، پ پ پ پ ا، ت ت ت ت ا...هتد.

شیعری (تابەکەی قوربان) سەر بەکێشی (ڕەمەل)ە، فاعلاتن، فاعلاتن، فاعلاتن، فاعلن

- ب - - ، - ب - - ، - ب - - ، - ب -

شیعری (ئەمان مردم) سەر بەکێشی (هەزەج)ە، مفاعیلن چوار جار دووبارە دەبێتەوە.

ب - - -

(( تابەکەی قوربان بنالم))

شیعری طاهیر (تاهیر) بەگی جافە

ڕۆستەم تەخمیسی کردووە

شۆی بڕی قەوسی موژانت سینە فەرمووی وەردەوە

مەیلی وەسڵە گوڵ بە فەصلە گوڵ و جۆی لێ هەردەوە

شەڕ بوو کردت دڵ بوو بردت تۆ لەژێری پەردەوە

تـابـەکـەی قـوربـان بنـاڵم من بە ئێش و دەردەوە
دەستـە ئـەژنـۆ قـوڕ بـەسـەر دائـم بـە ئاهی سەردەوە
ئافەرین رووت غارەتی کرد عەقڵ و هۆش و جان و دین
خـەوف دارەم ئـەز رەقیـبـان بچمـە مـاڵی تاج الـدین
چـەشنی مـەم تاکو نەمردووم من لە حەسرەت خاتوزین
هەروەکو قـەوس و قـەزەح بـا دەست لە گەردەن دانیشین
تـۆ بـە سـوخمەی ئاڵ و سەوز و من بە رەنگی زەردەوە
لـول و پێچـی زولفـی تـۆ ئـاڵۆز و ئـاڵاوە گـوڵم
موو بە موو تەوقە لەگەردەن بەند بە بەند بـەستی منم
تـاجـی سـورمـە تـۆزی بـەرپێت کەم لە کلدان بێ کلم
مـەرحـەمـەت کـە زوو بـڕۆ قـاصد بڵێ شـەرحی دڵم
نـازی پـاپـوجت ئـەکێشـم مـن بـە تـۆزو گەردەوە
حـوکـم و تـەقـدیـراتـی ڕەبـی ئایەتی نون و قەلەم
دڵ رەقـی تـۆ دەرحـەقی من شۆخەکەی قامەت عەلەم
جەوهەری عەرضە خەلاصە شەرحی صەدری پڕ ئەلەم
یـەك نـەفـەس چـاکی نەهێنا کەعبەتینی بەختەکەم
شـەش دەرم گیـراوە مـەشغـولـم بـەدەستـی نەردەوە
شقـڵـی بـاری عـەشقـی تـۆ شـانی وەها کردومە کۆم
بـێ خـەو و خـۆراك و گـریـەو دامـەنـی کردومە گۆم
سـا بفـەرمـوو دەستـی وەصـڵت دامـرێـنـی سفتـوسۆم
چـونکە مـن پـەشیمـانی بـالاو بۆسە چینی کوڵمی تۆم
چـی دەکـەم ئیتـر لـەسـەیری بـاغ و بێـنـی وەردەوە

یا سەنەم تاکەی ئەسیری بەندی ئەم ریشوانە بم
یا گرفتار و لە سیحری چاوەکەی فەتتانە بم
دەردەدار و غەم کەسارو بولبول مەستانە بم
رۆژێ ئەوەل بوو کە زانیم من ئەبێ دێوانە بم
عاشقی تۆ نەوعی مەجنوون وا بە کێو و هەردەوە
گول ئیلتیماسی کرد لەگەڵ چەهرەت پەراشودینی یە
مەجلیسی پرشەوق و نەشئەت صەد حەیف بودی نی‌یە
حەق بەلای (رۆستەم) کە قوربان گەر بلێ جودی نی‌یە
ئینتیماسی (طاهیری) بێ چارە هیچ سودی نی یە
تۆ کە هەردەم شەڕ فرۆشی بەو دڵەی وەك بەردەوە

((ئەمان مردم))

شیعری کوردی

رۆستەم تەخمیسی کردووە.

کەمەندی عەشقی شۆخێکم لەدڵ ئالاوە وەك ماری
قوتار نابم لە دەستی چی بکەم یاران بەهیچ بارێ
لەبەر چاوم دەچێ و دێ نازەنین لێم ناکا پسیارێ

ئـەمـــان مـــردم عیـلاجـیٚ سـا لـەڕێـی پێغـەمبەرا چـاریٚ
ویـصـــال یـــا قــاتـلـــە یـا تـەسکین لە هەرسیٚ بۆم بکەن کاریٚ
تـــەمـــاشـــای مــن مـەکـەن بەو چاوە دەمبینی لەسەر جادەی
بـــەدەستـــی خــۆم نـیـیــە هـاتوومە سەر ڕێی ئەو پەری زادەی
بــەهـەستـی خـۆشـەویستـی ئـەوگـوڵەی دڵ هاتە ئەو ڕادەی
وەهـــا سـوتـاوم ئـەصـڵاً تـابـی فـریـادم نـەمـا سا دەی
رەفـیـقـــان نـیـوەسـوتـەن ئێـوە نـامـەرد عـەرزە هـاواریٚ
جـەفـا نـەدرابـو وەك مـن مـەم لـەدەست هیجرانی خاتونی
سـەری فـەرهـادی مـەست نەبـووە وەکو من بسمیٚ بێستونی
دەڵێـی بـۆ مـن جێمـاوە بـەمیـرات زاری مـەجنـونـی
لـە کـونجـی سینـە دەنگـی ئـایـو ئـۆی دڵ دیٚ بە مەحزونی
وێـران بـوٚ نـەمـدی سـاتـیٚ لێـی نـەیـە نـاڵـەی بریـنداریٚ
نــەدیتــراوە کــەســیٚ وەك مـــن بــە جـوانـی خـۆی بیٚ باغر
حـــەزی پێبـیٚ ببینـی خـۆشـەویستـی خـۆی لـەنـاو ئـاگر
لــەسـەر ئـەو حـالـەتـەش هێشتـا دەڵـیٚ کوانیٚ لەمن چاتر
لـە نـەزعـا پێـی دەڵێـم قـوربـان جەفا بەس بیٚ دەڵیٚ کافر
ئـەمـە چیت دیگە تـۆ سەگ مەرگی (کارم) مەکە پێت جاریٚ
شـــەوانـی عـــومـری بـیٚ رۆژم لـەگـەڵ رۆژێکی ئـاوا کـرد
درێغـم لیٚ نـەکـرد دولبـەر لـە مـن دڵمـی کـە داوا کـرد
تـەمـاحـی مـاچـەکـی دامـیٚ منـی واشێت و شـەیـدا کـرد
ئـەلای هـەر کـەس دەچـم مـەنعـم دەکا خـۆت بۆچی ڕیسوا کرد
درێـــغ کـوا حـالیٚ زانـیٚ ڕەبـی تـوشـم بێـنی بێـمـاریٚ
دەڵێیمانگە لەژێرهەوری مەنعم لەسەر رووی چارۆگەی جورجێت

ئـەوەی زردەخـەنـەی دی لێـی دەگـۆڕێ بـێ گومان وەك شێت
هـەتـا وا تێ نـەگـەن تـۆراوە دڵ بـڕوا لـەدەسـت دەرچێت
سـەبـا یـارانـی مـەجلیس گـەر هـەواڵی من دەپـرسن لێت
بڵـێ کێشـاویـە مـەیخـانـە دوو چـاوی بێچـوە عەییارێ
گـرییێـکـم لـەدڵ دایـە دەڵێـن سـەودایـە زۆر چـاکـە
کـە دختـۆر هـات تـەمـاشـای کـرد ووتی دەردێکی زگماکە
سـەرم وا لـێ پـەشـۆکـاوە ئـەوەی نـەم مـابـێ ئیدراکـە
لـەژێـر بـاری خـەمـا واشـانـی صـەبـرم رێشـە ئێستاکە
فیـراقی یـار لـەبـەر ئـاخـر شـەڕی لێـم بـوو بەسەر بارێ
نـەبـوونـی چـاکـە رووی رەش بێ بەسەر پیاودێنی روو زەردی
لـەژێـر دەستـێ دەبێ تـووشـی هـەزار چـەشنـە بەڵاو دەردی
کـەسـێ وەك ( رۆستـەمـی) بـتـوانـێ ببینـی لـەبـەر وردی
دوڕو یـاقـوت دەبـارێ لـەم کـەلامـە شیـرینـەت (کـوردی)
خـوا وا سـا کـوا لـە دونیـادا قـەدر زانـێ خـەریـدارێ

تێبینی:-

هەر دوو شیعرم لە دەستنووسی شاعیر وەرگرتوون.

* * *

## رۆستەم حوێزی شاعیر و سرودی قوتابیان

رۆستەم حەوێزی کە شاعیرێکی میللی ناوچەی کۆیەیە، بەشێکی گەورەی شیعرەکانی بابەتی سیاسین و بەشێوەیەکی ساکارو سادە دەری بڕیون، لەبواری شیعری منداڵانیشدا ئەم لایەنە گرنگەی لەشیعرەکانیدا فەرامۆش نەکردووە، لای لە منداڵانی کوردستان کردۆتەوەو ئەرکی سەرشانی بەجێ گەیاندووەو چەند شیعرێکی جوانی پڕماناو بەنرخی

بۆ نووسیون، شاعیر بەچاوێکی پڕ ڕێزەوە دەڕوانێتە منداڵان چونکە دەزانێ کە لەدوارۆژدا پێ دەگەن و ئەرکی میللەتەکەیان دەگرنە ئەستۆ، بۆیە چەند بایەخیان زیاتر پێ بدرێت ئەوەندە دوا ڕۆژی نەتەوەکەیان گەش و ڕووناکتر دەبێت.

دیارە شیعر نووسین بۆ منداڵان سیما و خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە، تا ڕادەیەك شاعیر ئەم خاڵانەی پەیڕەو کردوون و توانیویەتی لەجیهانی منداڵان نزیك ببێتەوەو شیعرێك بنووسێ کە لەهەست سۆز و خەیاڵی منداڵان دوور نەبێت و لەگەڵ دەرونیاندا بگونجێ، هەروەها لەشیعرەکانیدا، دوولایەنی گرنگی پەیڕەو کردوون، لایەنێك کە سۆزیان دەبزوێنێ و شادی و خۆشییان پێ دەبەخشێ، ئەمەو لایەنی پەروەردەیشی بەخۆوە گرتووە.

شاعیر منداڵان فێر دەکات، کە یارمەتی یەکتر بدەن و ڕێزی یەکتر بگرن، نیشتمان و کوردیان خۆش بوێ‌و ڕقیان لەزۆردار و ناحەزان ببێتەوە، خەریکی خوێندن و خوێندەواری بن ولە نەزانین و تاریکی دوور بکەونەوە، ناکۆکی و ناتەبایی لەنێوان خۆیاندا نەهێڵن کە نیشانەن بۆ بەختیاری و رزگاری و سەرکەوتن.

شاعیر ووشەکانی ساکار و سادەن، ڕستەکانی زۆر ڕەوانن، کێش و برگەی شیعرەکان زۆر سووك و ئاسانن، بە جۆرێکن کە منداڵان حەزی لێ دەکەن، شاعیر بەشێکی زۆری بەسروود داناون بۆ ئەوەی لە قوتابخانەدا ئەزبەریان بکەن و بەشێوەی سروودو گۆرانی بیانڵێنەوە، بەتایبەتی لەشیعری:-

سبەینان سەر لەزوو، وەرە مەکتەب، ئێمە قوتابین، ئەزمنداڵێکی ساوام، بۆ قوتابیانی شەو، لێ دەرکردن، قوتابی ژیر، بۆ قوتابیانی مەعهەدی فەننی..تاد.

(ئەز منالێکی ساوام)

ئەز منداڵێکی ساوام
لە قوتابخانەی هیوادام
هەر لەدەرسی یەکەمدا
وای فێرکردم مامۆستام
نیشتمانم خۆش بوێ
کورد خۆشەویست بێ لام
رێزی گەوران رابگرم
لە زاڵمان نەکەم سەلام
بێز لە پیس و پۆخلێ کەم
نەبمە نۆکەر و غولام
بانگم بکەن بە بەڵێ
ئەز ئەدەمەوە وەڵام
گوێ لەدەرسێ رابگرن
لە قوتابیان وایە تکام

★ ★ ★

(وەرە مەکتەب)

وەرە مەکتەب بەیانی
هەتا تێبگەی بزانی
ژیان رۆژ بەرێ کردنە

چـــاوەنـــواڕی مـــردنـــە
یـــان چـۆنیـەتی ڕابواردنە
خـۆش گـوزەرانـی کـردنـە
لـەژێـر سـایـەی سەربەستی
رزگـــاربـیــن لـەژێــر دەستی
سـەر و مـــاڵمـــان پـارێزری
ئیش کار زۆر بێ و دامەزرێ
بــەدیـتـنی یـەك گوشاد بین
بــەخـــۆشــی و بـەمراد بین

★ ★ ★

(لێ دەرکردن)

قــوتـــابـی ژیــری وریـــــا
لێی پــرســـن دەڵـێ خێــــرا
یـــەك لـــەیـــەکـی گـەر بڕوا
تــەمــاشــەکـەی هیـچ نـەما
یـــەك لــــەدوان بێـنــــە دەر
یـــەك دەمێـنـــێ بـــەرامبـەر
یـــەك لـــە سێـیـــان دەربـێنی
دەبـیـنـــی دوو دەمـیـنــــــێ
یــــەك لـــە چواران بستێنی
سێــت بــۆ دێتــە سـەر سینی
یـــەك لـــە پێنجان ماوە چوار
بـــێ دوژمـــن نـــابێ هـۆشیار

یەك لە شەشان پێنج ماوە
خڕنووك ڕەگی لە ئاوە
یەك لە حەفتان ماوە شەش
پاكی زۆر باشە بۆ لەش
یەك لەهەشتان ماوە حەوت
كوردستان پڕە لەنەوت
یەك لەنۆیان ماوە هەشت
گەورەكی كورد بوو زەردەشت
یەك لەدەیان ماوە نۆ
دەڵێن دەبارێ گەزۆ
یەك لە یازدان ماوە دە
قەومی بەشخوراو كوردە

*　　* *

(سبەینان سەر لە زوو)
سبەینان سەر لەزوو
هەندی بڵێین یەك دوو
دەموچاومان دەشۆین
جل نەگۆڕین نان دەخۆین
موچانەمان وەردەگرین
سیپارەمان هەڵدەگرین
بەبێ هەست دێینە مەكتەب
ناكەین تۆز و تەپە تەپ
فیتە لێدرا ڕیز دەبین

لــــه پـۆلــێ دادەنـیـشیـــــن
مــامــۆستــا هــات هـەڵدەستین
گــوێ لـــەدەرســـێ رادەگــرین
کـــه لــــه دەرســـان بـــووینەوە
بــــــەرەو مــــاڵ دەبـیـنـــــەوە

* * *

(ئێمه قوتابی شەوین)

ئـێـمــه قــوتـابـی شەویـن
تـێـدەکـۆشیـن به هیمەت
بـۆ ئــەوەی تــاکو بگرین
بــەری هــەوری جەهالەت
ئــەو هــەورەیه تـا ئێستــا
ئـێـمــەی خستۆته زیللەت
داخۆ له جووش کەمترین
ئێمــه نــەبـیـنـه دەوڵــەت

* * *

(ئێمه قوتابی)

ئێمـــه قوتـابی کۆی سەرەتایین
لەژێر سێبــەری فەرمانڕەوایین
چرای رووناکی ناو کوردەوارین
دژی نەزانی و لێکدی جودایین

کاربەدەستانی رۆژی دوایین
بەدڵ و بەگیان لەگەڵ تەبایین
شاعیر سوودی لەکەلەپوری میللیمان کە فۆلکلۆرە وەرگرتووە، تا بەهۆیەوە منداڵان سوودی لێ وەربگرن:
(هەیاران و مەیاران)
هەیاران و مەیاران
یاخوا نەبارێ باران
هەتا وەکو کاکە ماد
بۆم دێتەوە لە شاران
لەگەڵ پلە گەزمنگی
مادو دەچێتە ماران
لەگەڵ دایە شیلانی
ماد و دچێتە شاران
لەگەڵ خاڵە ئارازی
ماد و دەچێتە داران
لەگەڵ مامە پێشەنگی
ماد و دەچێتە تاران
ماد و کورێکی چاکە
ناچێتە ناو منداڵان
بەیانییان دەچێتە مەکتەب
بۆم دێتەوە ئێواران (١).

* * *

(بسکو بسکو)

بسکو بسکو بنووه دەنگی بلووری شوان دێ

دەنگی شایی و دەهۆلان لە گردی جوان دێ

قیژەو گارەی کیژۆلان لە ئۆمەر خوچان دێ

دیدە دیدی ترومبێلان لە هەیبە سولتان دێ

حەمامی جمهووری لە هەیبەت خان دێ

* * *

(هەممە شکێ)

هەممەشکێ کورە هەممەشکێ

پڕ لە دۆدانی کەشکێ

شەبەق دەستی دا گەسکێ

حەوش و ژوورو هەیوانی ماڵی هەتا بەردەرکێ(٢)

هەر چی لەشەبەقی دا خوا بکا دەستی بشکێ

منداڵ حەز لەجیهانی ئاژەڵ دەکات، بۆیە شاعیر چەند شیعرێکی لەسەر زاری ئاژەڵ هۆنیوەتەوە چونکە منداڵ حەز لە پاڵەوانێتی ئاژەڵ و باڵندە دەکەن و لایان زۆر خۆشەویستن.

(پیشلە)

پشیلە دەڵێ میاو میاو

نەنانم هەیە نە ئاو

تیکە نانێکم دەنێ

خوا زووبتان کا بە پیاو

کەریش دەڵێ زەڕە زەڕ
حەیوانێکم لاڵ و کەڕ
ئیشی زۆرتان بۆ دەکەم
بەستەزمانم وەك مەڕ

گورگ دەڵێ لووزە لوور
سەرم سپییە و لاقم سوور
فەرخەی هێندە ئازام هەیە
یەك لەیەکەی چەند جەسوور

سەگیش دەڵێ حەوە حەو
نانمان بدەن بژین بەو
ئێمە پاستان ئەکەین شەو
کاتێ چاوتان چوو لە خەو

پەراوێزەکان:

١. گزنگ و پێشەنگ کوڕی مامۆستا ڕۆستەم حەوێزی شاعیرن، ماد کوڕی چەلەنگە کە ئەویش کوڕی مامۆستا ڕۆستەم حەوێزییە.
٢. شەبەق کچیەتی خاوەنی بڕوانامەی ماستەرەو ئێستا مامۆستایە لەکۆلێژی کشتوکاڵ.

٢. شیعرەکان بەشێکیان لەدەستنووسی شاعیرو بەشەکەی تریان لە ئەرشیفی خۆمەوە وەرگیراون.

((تاوێك لەگەڵ چوارینەکانی ڕۆستەم حەوێزیدا))

چوارین بەو پارچە شیعرە دەوترێ کەلە چوار لەتە دێڕ پێك دێت و لەسەرەیەك کێش دەڕوا، بەگشتی سەرواکانی (أ أب أ)، هەشە کە سەرواکانی بەجۆری تره وەکو (أ أ أ أ) چوارین شێوازێکە لەشێوازەکانی هونەری شیعریی لە بابە تاهیری هەمەدانی یەوە کەسەرەتای شیعری

کوردییە بۆمان ماوەتەوە، پاشان شاعیرانی کورد بە ڕووخسارو ناوەرۆکی نوێو جوداوازەوە، بەکاریان هێناون، بەتایبەتی لای کامەران و شێرکۆ بێکەس ناوەرۆکی شۆڕشگێڕیان پێ بەخشیوە، ماناو بیرێکی سەربەخۆی هەیە کەبە کورترین ڕێگا دەخرێتە ڕوو تاوەکو بەزوویی کاریگەری خۆی لەخوێنەر بکات.

هەر بۆیە زۆر بەشیعری بروسکە ناودەبرێت چونکە بروسکە ئاسا خێرا پەرش و بڵاودەبێتەوە ڕۆڵی خۆی دەبینێ لەهۆشیار کردن و ڕاپەڕاندنی جەماوەردا. لەبارەی چوارینەوە د. محەمەد نورەدین عبدالمنعم دەڵێ((وەك ئەوە وایە کە شاعیر دەریایەك لەناو دەفرێکی بچووك بکا))[1].

هەندێ توێژەرەوەی کوردو عارەب کێش دەکەن بە پێوانەی جیاکردنەوەی چوارینە لەدوو بەیتیدا، بۆ نموونە د. کامل بەسیر کە کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەدیبانی عارەب لە پێشەکی گەنجینەدا دەڵێ ((چوار خشتەکی دوو دێرە لە هەڵبەستدا مەرجی چوار خشتەکی ئەوەیە کە کێشرابێ لەسەر کێشێکی دەرهێنراو لە هەزەجداو هەروەها مەرجی ئەوەیە کە ئەو دوو دێرە مەبەستێکی تەواو بگەیەنێ))[2].

جا بزانین د. عەزیز گەردی کە پسپۆڕی ئەم مەیدانەیە لەم ڕووەوە چی دەڵێ:(لە ڕاستیدا چوارینی کوردی بەکێشی روباعی فارسی و کێشی دوو بەیتی و زۆر کێشی تری عەرووزیی و کێشی خۆماڵیش هاتووە))[3].

بەش بەحاڵی خۆم لە ڕەحمەتی ڕۆستەمی شاعیرم پرسی کە ئایا کێش پێوانەیەکە بۆ چوارین لە وەڵامدا ووتی من چوارینەکانم لەسەر بنەمای کێشی فارسی و عارەبی نەهۆنیوەتەوە، بەڵکو چوارینەکانم بەکێشی خۆماڵی داناون. چوارینەکانی ڕۆستەم بەزۆری بەر کێشی دە

برگەیی و چواردە برگەیی کەوتون، لەرووی سەرواشەوە هەر چوار دێر سەروای هاوبەشیان بەخۆوە گرتون، لە رووی ناوەرۆکەوە کێشەی سیاسی و گیروگرفتی کۆمەلایەتیو نەتەوەیی تێدا خراونەتە روو بە زمانێکی ساکار و سادە کۆمەلێك وێنەو دەستەواژەی پەند ئامێز ئاوێتە کردوون تاوەکو بەزوویی خەلکی لەبەری بکەن و لە ئەزموونی رۆژانەیاندا وانەی لێ وەربگرن.

رۆستەم بەشێکی چوارینەکانی بەپەندو قسەی نەستەق دەولەمەند دەکات چونکە چاك دەزانێ کەپەندی پێشینان فەلسەفەی ژیانەو لە ئەزموونی دوورو و درێژی ژیانەوە لەدایك بوون بۆیە لەم چوارینەدا ئاماژە به دوو پەندی کوردی دەکات، وەکو قسە کەوتە زاری ئەکەوێتە شاری یاخود هەر ئاهێ لە ئاگاهێ، شاعیر فێرمان دەکات کە دەبێ هەتا پێمان دەکرێت نەهێنیەکانمان بپارێزین و مرۆڤی عاقلیش هەر یەك جار دەسخەڕۆ دەکرێت زوو ئەزموونی لێ وەردەگرێت:-

هەلناگیرێ بەدەستێ دوو گندۆرە بەجارێ
قسـه بکەوتە زارێ پەرتەی دەکا لە شارێ
فێلـی لێ ناکرێ عاقلێ تەنها زیاتر لەجارێ
پێشینان گووتیانە هەر عەقلە لە خەسارێ

لە چوارینەکانی تری فەلسەفیدا شاعیر دەیەوێ بلێ کە گیان، گەرمایی دەگۆڕێ جا بدیترێ یا ندیترێ، تیشکی رۆژیش ماددەیە کە ئەنشتاین، بەتاقیکردنەوە روونی کردۆتەوە، هەموو شتێ ماددەیە و

دیاره ماددەش دەگۆڕێ بەدەنگ و روو شێوه یانی مرۆڤ بە دوو شێوه لێکتر جیادەکرێتەوه ئەگینا هەمووی هەر لەماددەی دروست بوون.

گەرمایی رادەگوشرێ گیانێکی بۆ دەرسکێ
بدیترێ یانەدیترێ هەتا رۆناکی تیشکێ
هەره چەندە پێگەیشتێ ئەویش داوێ پرپشکێ
بەدەنگ و روو و شێوەی دەگۆڕێ یەك بەیەكێ

شاعیر دەڵێ هەندێ کەس هەر بەتەنگ خۆیانەوەن ئاگایان لەکەسی تر نیيە، هەر خەریکی گیرفان پڕ کردنن، جا بەهەر جۆربێ بەلایەنەوە گرنگ نیيە.

هەر پێویستیيەکی هەیتی ئینسان دەکرێ و بەکرپینە
ئەوانەی ئیشێ دەکەن لەخۆشی بێ بەرینە
رێگای خەرج کردنی پارەی پان و بەرینە
رێگای وە دەست کەوتنی پارەی بەقوڵ برپینە.

* * *

سەرچاوەکان:

١ – د.محمد نورالدين عبدالمنعم، دراسات في الشعر الفارسي، القاهره، ١٩٧٦، ص٢٣٦.
٢ – دڵزار گەنجینه، بەغداد، ل١٣.
٣ – عەزیز گەردی، کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، هەولێر، ١٩٩٩، ل٢٦٨.

## کارەساتی کۆیە لە شیعری رۆستەم حەوێزیدا

بەراستی کارەسات و رووداوەکانی ساڵی ١٩٦٣،کارەساتێکی کوشندەو جەرگ بڕبوو، چونکە بەعسیەکان سیاسەتی قڕ کردنی گەلی کوردیان پیادە دەکرد، بۆیە لە ١٩٦٣/٦/٩دا سوپای عێراق و حەرەس قەومیە بەعسیەکان هێرشێکی کتوپڕیان کردە سەر شارەکانی کوردستان و بەدەیان کەسی بێ گوناهیان گوللە باران کردن، تەنانەت لەشاری کۆیە زیاتر لە (٣٥)کەسیان شەهید کردن، لە ١٠ی تەمووزی ١٩٦٣دا، رادیۆی

بەغدا بلاوی دەکردەوە، کەلە هەر شوێنێکی کوردستان تەقە لە سەربازەکانی بکرێت ئەوا ئەو شوێنە وێران و خاپوور دەکرێت، هەر لەمانگی تەمووزدا تورکیا و ئێران لە کۆبوونەوەی نهێنی خۆیاندا، بڕیاریان دا کە شۆڕشی باشوور بەهەموولایەکیانەوە دایدەمرکێننەوە، بۆ ئەمەش ئێران ڕێگای بە بەعسیەکاندا کە بچنە خاکی ئێرانەوە بۆ ئەوەی پێشمەرگە ڕاو بکەن هەروەها زۆر بە توندی سنورەکانی خۆی بەهێزکرد تا ڕێگای کێشانەوەیان نەبێ لەکاتێك کە جەیشی عیراقی هێرشیان بۆ دەهێنێ، هەروەها عیراقیش ڕێگا بە فڕۆکەکانی ئێران دەدا کەبەسەر ناوچەکانی سەرسەنگ و ئاکرێو ڕەواندز بفڕن و کۆنترۆڵی هێزی پێشمەرگە بکەن، لە ١٩ی حوزەیراندا تورکیاش بڕیاری یارمەتی دانی سوپای عیراقی ڕاگەیاند، لەلایەکی ترەوە رژێمی بەعسی سوریاش بڕیاری هاریکاری بەعسیەکانی عیراقی کردو بۆ ئەم مەبەستەش هێزی یەرموکی نارده کوردستان، شوکر هێزی پێشمەرگە دەرسێکی باشی دانێ و بەشکست و زەرەرێکی زۆرەوە گەڕانەوە. دەوڵەتە هێز زلەکانیش وەکو ئەمریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیای رۆژئاوا درێغیان نەکرد، بەریتانیا (٢٥٠)فڕۆکەو سەد ئوتومبێلی زریپۆشی بە بەعسی فرۆشت، ئەمریکاش تەقەمەنیەکی زۆری بۆ عیراق هەنارد، ئەڵمانیای رۆژئاواش قەرزێکی زۆری بەعیراقدا بەم شێوەیە هەموو لایەك بەشدارییان کرد بۆ سەرکوت کردنی شۆڕشەکەمان، تەنیا شورەوی نەبێ کەهەڵوێستی مەردانەی هەبوو، ئەوەش بەلای منەوە بۆ سیاسەتی عیراق دەگەڕایەوە، چونکە عیراق سیاسەتێکی دوژمنکارانەی بەرامبەر شیوعیەکانی عیراق و یەکێتی سۆڤیەت هەبوو، بۆ ئەمەش یەکێتی سۆڤیەت لە ٩ی تەمووزی ١٩٦٣دا وڵاتە دراوسێکانی عیراقی ئاگادار کردەوە، کە دەست نەخەنە

کاروباری کوردەکانەوە، تاڕادەیەك کارێکی باش بوو، بەتایبەتی لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتوەکاندا ڕوونی کردەوە کە قڕکردنی کوردەکان لەعیراقدا بارێکی ئالۆز لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست چێ دەکات وئاسایش و ئارامی لەناوچەکە تێکدەداو دەیخاتە بارێکی پڕمەترسیەوە.

ڕۆستەمی شاعیریش بەر شالاوی گرتن و لێدانی بەعسیەکان دەکەوێ و بەم جۆرە لەگەڵ بەشێکی زۆر فەرمانبەرانی کۆیە دەست گیر دەکرێن و ڕەوانەی شاری کەرکوکیان دەکەن، جا شاعیر لە ١٩٦٣/٦/٢٨، ئەم شیعرە درێژەی لە گرتووخانی کەرکوك دەنووسێ بۆ شاری کۆیەی دەنێرێتەوە، شاعیر زۆر بەوردی باسی جوانی و قەشەنگی شارە خنجیلانەکەی حاجی دەکات، لەدیاردە بچووکەکانەوە بەرەو شتە گشتییەکان دەچێ و شیعرەکە لەسەر شێوازی فۆلکلۆری کوردی نووسراوە، کێشێکی سووکی هەیە کەکێشی دە بڕگەیی یە، کە بەکێشی نەتەوەیی ناسراوە.

بە زمانێکی زۆر ساکارو سادەو پەتی داڕێژراوە، چی ڕووی داوە، بەشێوەیەکی ئەدەبی بۆمان دەگێڕێتەوە، بەتایبەتی ئەو سیاسەتە چەپەڵەی بەعسیەکان کەلە شەستەکاندا لە گرتووخانەکاندا پەیڕەویان دەکرد،

بەسەرهاتی کۆیە

هەی داد هەی بێداد هاوار هەی هاوار
بۆ شاری حاجی قادری نازدار
بمرم بۆ حاڵی دەربەدەرانی
بۆ گرتوەکانی بەندی زیندانی
بۆ باغەکانی شیوی ڕەزانی

بـــۆ دارەکـــانـــی ســەر گـــۆڕستـــانـــی
بـــۆ خـــەســتـەخـــانەی پڕ لەدەرمانی
بـۆ بـانـگ و سـەڵای مـزگـەوتەکانی
بـــۆ لاوەکـــانـــی کـــوردی دڵ گـــەرمی
بـۆ کـیـــژەکـــانـــی مـــەردی بـە شەرمی
بـــۆ خـــانـــوبـــەرەی مـــاڵـــی حـەماغەی
قەسەرە جوانەکەی بەر ئاشی ســـاغەی
قەسری رەحابی کاك عوسمـــان عەونی
هەر چەندی پێدەی دەهێندەی دەینـــی
قەسەرە جوانەکەی تـــاهیر عـــەزیـــزی
بـۆ دار و بـــار و گـــوڵ و فـــریـــــزی
بـــۆ بنـەمـــاڵـــەی مـــاڵـــی مـام خدری
بـــۆ ئـــەو لاوانـــەی نـەخـرانە قەبری
بـــۆ چـایخـانـەکـەی فـەتـاح حـەکیمـی
کـەلێنـە گـەورەی مـەلا مـەعـسـومـی
بـــۆ کـەبـابـەکـەی وەسـتـا عەبدوڵڵای
بـــۆ میـوەجـاتـی کـاك صابر حەلوای
بـــۆ گـەراجـەکـەی بـەرامـبـەر ڕێنگەی
بـۆ لاوەکـانی بـەسـتـران لـەدینگـەی
لـەبـۆ مـەخـزەنـی کاك بەکری بەنـا
هـەرچـی داواکـەی بـەکـەس نـاڵێ نـا
لـەبۆ کـۆگـاکـەی جـوانی بابەکەی
هـەر چـی داواکەی قەت نـاڵێ نـەکەی

لەبۆ مەخزەنی حاجی جەمالی
بۆ کۆشك و سەرای کاکە کەمالی
لەبۆ مامڵەتی حاجی سکتانی
بۆ بنەماڵەی کاکی شێخانی
بۆ خزمەکانی ئالی حەوێزی
مامورەکانی گەورەو بەڕێزی
بۆ تەکیەو بەرەی کاك شێخ حوسامێ
بۆ قسەی خۆش و چایەی بەتامی
بۆ دارو باری مەیدانی خوارێ
بۆ ماست و کاردی فەصلی بەهارێ
بۆ کۆشکە قوڕی خاڵ مستەفاغەی
هێنایانە دەر بەردی بناغەی
بە زەبری پاج و نەوت و باڕوتی
تۆزی نەماوە لەبۆ بڕموتی
بۆ مەڕ و ماڵی گوندی کورداوە
بۆ خانوبەرەی ئاغای تۆبزاوە
بۆ تالان کرای گوندی هەرمۆتە
بۆ شەهیدانی دێی مزگەوتۆکە
ئەم دی رووبدا وەك کۆ لەشارێ
مەئمورەکانی بگرن بەجارێ
خرکرانەوە لە حەوشی سەرا
سەرتا بەخوارێ گێسکی لێ درا
قائمقامی نوێ عەباسی خەڵەف

هەر گەیشتە جێ دەستی کردە گەف

بەبێ سەلام و کەلام و حیلە

ئەوانی خستە ژووری تەویلە

لەلای عارەبان چەند بەنرخە کورد

لەجێی دە ولاغان صەد کەسی تێکرد

بەقرچەی هاوین جێگاش وەها تەنگ

دەرگا دادەخرا دەبووە شەوە زەنگ

هەرچی دەمان خوارد دەبووە ئارەقە

خۆزگە بەو شەوەی کە دەکرا تەقە

قەدەغە دەکرا رۆژێ سەراسەر

بۆسەر پێشاویش هەتا چوونە دەر

لەگەڵ زەمانەی ئینسان بلێ چی

نا مەردێ وەها وەکو تەها شەکرچی

لەسەر گرتیەکان دەیخوڕی و دەیبڕی

بە ئاسمانی کورد هەتا دەوەڕی

خۆی هەڵدەکێشا دەی گوت بێ شەرم

انا انا ثورت وەحدی عەبدولکریم

زورنای فیشاڵی دەکوتا بەبێ پێك

ماموستا زەکیش ووتی هەلەبیك

بەدرۆو دەلەسە بردینە مەعسکەر

نێزیکی مانگی وایان بردە سەر

هەتا کوو دانراوە لوجنەی تەحقیق

زۆر کـەس وەخـت بوو بگرێ سیل و دیق
قـائمقـامـەکـەی عـەبـاسـی بەد فەڕ
شـەوەکـی نـاردی ئـەو بـەدوای مەزهەر
ووتـی پێـم بڵـێ لێـرەکـێ پـارتـە
دەنـا دەتکـوژم ئێستـا لـەو کـاتـە
مـەزهـەریش ووتـی ئـەمـن نـاتـوانم
خـۆم حیـزبـی نیمـەو نـاوان نـازانـم
ئـەورقـی هـەستـا خێـرا دەم و دەسـت
کـاکـە مـەزهـەریان توند لەدارێ بەست
پێیـان بـڕی بـوو تـەواو لـە ئـەرزی
ئـەوەی دەتـرسـا وەك وی دەلـەرزی
ئینسـان نـەیدیـوە لێـدان بـەو جۆرە
خـۆیـان مـانـدوو بوون کـردیانە نۆرە
بـەچـار دەستـەکـی هـەر لـە دوورەوە
کـاکـە مـەزهـەریـان هـەڵـدا ژوورەوە
لـەبـۆ بـەیـانی کە چووینە کـەرکوك
ڕۆژێ نـەمـان خـوارد نـەنان نە ئەستوك
شێمـەیـان بـردە مـەوقیفـی سـەرا
لـەوێ نـابینـی بـە ڕۆژ بـێ چـرا
هـەر وەك شێلمـی ئینسـان دەگـۆڕێ
بـە زستـانـانیش پـانکـە دەسـوڕێ
زیـاتـر لـە پـەنجـا هـەر شێتی لێ یە
جـەهـەنـدەم هـەبێ بێ شك ئەوێ یە

لەبۆ بەیانی چووینە موعتەقەل
هۆڵێکی زلەو دەگرێ دە مێگەل
جێگایەکەشمان لەناو ئۆردووە
هەر بێرە بڵێین قەبری زیندووە
کەونە مەخزەنی ئەرزاقی جەیشە
هەر چوار قاوشی لەسەریەك حەوشە
سەرمان تەنەکەو بنمان چیمەنتۆ
دەبێ چەند سار بێ بە تەخمینی تۆ
رۆژێ سێ جاران دەچینە سەراو
هەر بە هانەکە هانك بەغارو بەتاو
ماوەی هەر جارەی دە دەقیقەیە
لەپاش ئەو ماوە ئەو جا فیقەیە
لەدوای یەکتری دەکەین شریتە
دەنگی تڕانیش فیشەکە شێتە
شۆربەیە نیسکە تێ شووی بەیانی
دانی تێدا نییە لە بۆ دەرمانی
لەبۆ نیوەڕۆ کولەکە زەردە
بڕوا بفەرموو میقرۆبی دەردە
لەبۆ ئێواران شۆربای شێلم
باسی خواردنی بەجێ دەهێڵم
تەنەکەی نەوتێ کورسی تەراشە
لێرانە هەر ئاو بۆمان بەلاشە
چایەش لێ دەنێین هەر لەمەنجەرێ

لـــه رووی نـــاچـــاریـــش مەجبوری دەگرێ
مـــانگـــی دووجـــاران مـــواجـــە هـــەیـــە
مـــواجـــەهـــەی چـــی هـــەر بـــەناو هەیە
لـــە ئـێمـە غـــارو لـــەوانـیـــش هـــاوار
وەك تـێـــك بـــەر دەدرێ بـــەهار بەرخ و كار
نـــاگـــەینـە یـــەكـــدی سیممـــان نێـوانـــە
وەك رۆژی حـــەشـــره ئـــەو دەشتـە پـــانە
لای ئێمـــە جـونـــدی و لای وانـیش ئەمنە
تـــەنهـــا مـونـەیـــد قـسـەی زۆر تـــڕنـە
كـــارێكـــی وایـــان بـــە كـــۆ كرد عەرەب
هێنـــدەی تـــریشیـــان نـــاردنە مـــوسەیەب
شیعـــرەكـــەی لە ئەرشیفی نووسەر وەرگیراوە......

## هەندێ بیرەوەریم لەگەڵ شاعیری شەعبی ناوچەی كۆیە مامۆستا رۆستەم حەوێزیدا

لە هەفتاكاندا لەگەڵ مامۆستا رۆستەم حەوێزی شاعیر ئاشنایەتیم پەیدا كرد هەر چەندە كاك رۆستەم زۆر بەتەمەن لەمن گەورە تربوو، ئەوەی لە یەكتری نزیك كردبووینەوە شیعر و ئەدەب بوو مامۆستا شاعیرێكی قسە خۆش و نوكتە باز و قسە لە ڕوو زۆرزان بوو، شیعرەكانی لە ڕووی ڕووخسارەوە ساكارو سادەبوون بەڵام لە ڕووی ناوەرۆكەوە بەبیری پێشكەوتن خوازانەوە داڕێژرابوون كاك رۆستەم هەموو شیعرەكانی خۆی

ئەز بەرکردبوو گەلێ شیعری بلاْونەکراوی حاجی قادرو فایقی شاعیری لەبەر بوو کاتی خۆی بەشێك لە شیعری بلاْونەکراوەکانم لە رۆشنبیری نوێ و عیراق بە کوردی بلاْوکردونەتەوە زۆرجار عەسران بەرەو باسکی عەرەبیان و گردی ڕێزەتوان پیاسەمان دەکرد کاك رۆستەم هەر شیعرێکی تازەی نووسیبا بۆی دەخوێندمەوە ١٩٧٦/٢/٢٤ بەرەو گردی رێزە توان دەرچووین کاك ڕۆستەم ئەم چوارینەیەی بۆ خوێندمەوە:-

لەناو ولاْتی بابە گورگوڕ بی
عەیبە دانیشتوی لەسەرمان سرِبی
خانوو بەرەیان لەخشت و قوڕ بی
لەبەر دەست غەیرەی بێ دەنگ و کرِبی

ئاگزوری کۆمەلاْیەتیمان و دواکەوتووی میللەتەکەمان لە زۆربەی زۆری شیعرەکانی شاعیردا ڕەنگیان دابۆوە، بۆیە زوو دیاردەو ئاستەنگەکانی کۆمەڵی کوردەواری بە چوارینە بۆ دەخوێندمەوە:-

روسیش کەژاوەی ناردە ناو مەریخ
ئەپۆلۆشمان دیت لەناو مانگ بوو یخ
لێیان هێنا خوار بەرد و شاخ و زیخ
کوردیش نان دەکەن بەتەپاڵەو ڕیخ.

لە ١٩٧٦/٣/٩ لە گازینۆی کەریم سەلیم شیعرێکی دڵداری خۆم بۆ کاك رۆستەم خوێندەوە سەرەتاکەی بەم شێوەیە بوو:-

کوانێ خاڵی دەسکردی سەر کوڵمەکانت؟
کوانێ کراسی زەرد و شینی یادەکانت؟

کوانێ نیگای چاوی شیعره جوانەکانت؟
کوایی نەشمیلەکەم خۆت کوانی
بۆ هیچ کەسێ پێت نازانی
کاك رۆستەمیش وتی:-
منیش بەم چوارینە وەڵامت دەدەمەوە بەهیوام سوودی لێ وەربگریت:-
مەم تۆقێنە بەتۆقەی
مەم ترسێنە بە تەوقەی
لەیاد مەکە ئەو زەوقەی
تا لەدەست دەکەی هەڵقەی
پاش چەند رۆژێك كاك رۆستەم وتی تۆ نازانی وەسفی كچ بكەی سەیركە بزانە من چۆن وەسفی دەکەم:-

شەرمە بڵێم جوانە بەدیمەن و سەرو پرچ
مەمکو گوڵمی رابگوشم ماچی بکەم مرچە مرچ
دڵی خۆمی پێخۆش بکەم لە سمتیی بگرم نقورچ
بە پێکەنینی بێنم بەچەند گۆتەی پڕو پووچ
گوتم كاك رۆستەم لەبەر ناخۆشی ژیان هەموو رۆژێك پەلاماری مەی دەدەی ئەدی بۆچی شیعرێکی جوانت لەسەر مەی نەنووسیوە لەوەڵامدا ووتی:-
من و پێك بووینە ئێلك

ئێوارەی ١٩٧٦/٣/٢٨ بۆ ماڵی کاك ڕۆستەم چووم کاك ڕۆستەم ووتی چوارینەیەکم بۆ وەسیەت نامەکەم نووسیوە:-

بەجێی دێڵی ئەتۆش وەك من بەجێم هێشت
ئەوەندەی مام گەلێکم غەم برا چێشت
بە مەرگم باری خۆم سوك کرد دەزانی
گرانی ئەرکی ژیانم پێوە هەر ڕشت

* * *

## لە یەکەمین ساڵوەگەڕی کۆچی دوایی ڕۆستەم حەوێزیدا.

ڕۆستەم حەوێزی کە شاعیرێکی میللی ناوچەی کۆیە یە، بەشێکی زۆری بەرهەمەکانی بابەتی رامیارین و زیاتر ئامانجی خستنە رووی بیر بووە، بۆیە زۆر گوێی بەهونەری شیعری نەداوە، جگە لەشیعری رامیاری، هەندێ بابەتی دڵداریو وەسفی نووسیون، بەتایبەتی ئەم شیعرەی کەبەناوی شاری کۆیەیە شاعیر وەسفێکی ورد و جوانی شوێنە سازگار و دڵرفێنەکانی شارە خنجیلانەکەی حاجی قادر دەکات و دەڵێ:-

دەڕوا عومری لە کیسی کەسێ دەمی بەهاران

لــه گــردی مــام جــهرجیسی دانــهنیشیّ ئیّواران
دیــار بــه دیــاری کــه کوّنی قشلّهی سوّرانی کوّنی
گــولّــزاری گــوّنــاو گــوّنــی شــهقامی خویّندهواران
نــازانی بنــواریــه کــــویّ بــاواجی و حــهمــاموّکیّ
میــر سهیــد و چنـــاروّکــیّ ڕمزو بــاغی ههنـــاران
دهنــوارییــه ئــهو بــهرهی گـردی سیّوکهو چهمبهرهی
میّر گولّهی کانیــه قهرهی سهیرانگهی گویّ به گواران
لــهولای سهلکـــی کــافــری تــا ڕووبــاری گـازری
کــهرکــوك دیــــاره ئــاگـری مهیدانی شوّڕه سواران
لــهولای گــــردی ڕیّــزه تــوان پــانتــایی کانیه بسکان
ســهیــرانگــای ئوّمـهر خوچان سهر شهقامی دلّداران
ڕوو لـــــه هـهیبـه سـولّتــانــی دیمـهنــی دارستــانی
گومبهت و کانی جوانی ههوارگهی چاو به خومــاران
لـهســـهر ســـهری ســـهرایـــه تـــهمــاشاکهی دنیـــایه
چیـای قــهنـدیلی لـه لایه لـهلای کیّوی خــالّخالاّن
ڕووکـه چیــای حــهمــرینــی تـی چاوت ده سهفینی
بــهولای پیـره مــهگــرونــی چــهم و زیّ و ڕووبــاران
شــــاری عیلـم و پیــاوهتــی ســهرچاوهی کوردایـهتی
مـــهلّبـهنــدی مـهردایـهتی کوّی ئــاواتــی هـهژاران(١)

١) شیعرهکه له ئهرشیفی نووسهر وهرگیراوه.

## زەكی هەناری شاعیرو وەرگێڕ

زەكی هەناری لە كۆشی خێزانێكی رۆشنبیر چاوی كردۆتەوە، گوڵستان و بوستانی خوێندووە، دایكی خوێندەوارێكی باش بووە، سوختەخانەی لە كۆیە كردۆتەوە، مندالآنی گەڕەكی فێر خوێندن و نووسین كردووە، ماوەبەكیش لەلای (مەلای رەش)دەرسی خوێندوە، پاشان چۆتە قوتابخانەو ساڵی ١٩٢٦ قوتابخانەی سەرەتایی لەكۆیە تەواو دەكات، لە ساڵی ١٩٢٨ (دارالمعلمین) لە بەغدا بە پلەی زۆرباش دەبڕێ، بۆ قوتابخانەكانی كۆیە دەگەڕێتەوە و بەردەوام دەبێ لەوانە ووتنەوە لەكۆیەو رانیە و هەولێردا.

مامۆستا زەکی رووخۆش و خۆشەویست بووە، زۆر ساکار و سادەبوو لەلایەن قوتابیەکانەوە زیاد لەپێویست رێزی لێ گیراوە و قوتابیەکان گوێ رایەڵی قسە بەنرخەکانی بوونە، لەگەڵ فەرمانبەر و ئەشرافی کۆیە پەیوەندی باشی بووە، رۆڵێکی باشی بینیوە لە پەرەسەندنی قوتابخانەو پەرەپێدانی قوتابیان، هەر چەندە ئەو کات لەلایەن هەندێ لە مەلا کۆنە پەرستەکانەوە دژایەتی کراوە، مامۆستا زەکی لە قوتابخانەدا سرودەکانی خۆی بە قوتابیان دەوتەوە، بەم جۆرە ناوبانگی لەناو قوتابیان و خەڵکی شاردا بڵاوبۆوە، زۆر چالاك و وریا بووە توانایەکی باشی لەدانانی شیعر و چیرۆکدا هەبووە، جگە لە وەرگێران لە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و ئینگلیزی دا.

### هەناری لە چیەوە هاتووە؟

دەربارەی هەناری چەند بیروڕایەك هەیە، بە کورتی ئەمانەن:-

١. هەندێك دەڵێن باوکی خەڵکی گوندی هەنارەی خەلان بووە، باوکی لە شێخەکانی وێ بووە هاتۆتە شاری کۆیە، ئەگەر خەڵکی گوندی هەنارەی بونایە، پێویست بوو بوترێ (هەنارەیی).
٢. ناوی نەکیان هەنار دەبێ خەڵکی پێیان وتووە (هەنارێ) چونکە ئافرەت ئەگەر مێردی زوو بمرێ، منداڵەکان بەناوی ئەوەوە ناو دەبرێن واتە بەناوی دایکیان، ئەمە لە کۆیە باوە.

٢. هەر چەندی خۆیان واتە مامۆستا زەکی وای دەردەخەن کەلە (هەنارەوە) هاتوون، (هەنارە) گوندێکە لای دەربەندی گۆمە سپان. هەندێکی تر دەڵێن خانووەکەیان لە تەك ماڵی ئەمین ئاغای ئەختەربووە، ماڵی مامۆستا زەکی پڕ دەبێ لەدار هەناری بەرز و لەماڵی مامۆستا زەکییەوە ئاو بۆ ماڵی ئەمین ئاغای ئەختەر چووە، کاتێ ماڵی ئەمین ئاغای ئەختەر ئاویان دەبڕێ، دەڵێن ((لەهەناری یان نایە ماڵی هەناری)) واتە ئاوەکەیان بەرداوەتەوە سەر دار هەنارەکان.

زۆر تر ئەم ڕایە پەسند دەکرێ، مامۆستا عبدالرحمان برای مامۆستا زەکییە ئەم رایە بە پەسند دەزانێ بەڵام ئەویش زۆر متمانەی پێ نییە.

لە ساڵی ١٩٣٦ بەڕێوەبەری قوتابخانەی ڕانیە بووە، ئەم شیعرە دڵدارییەی داناوە کە سەرەتاکەی بەم شێوەیە.

تۆخوا بۆ نەگریم بۆ بەختی ڕەشی خۆم
پەروەردەیی دڵ بووی ئێستێ دەڵێ چی تۆم
ئەی سەرووی سنەوبەر بۆنت وەکو عەنبەر
گەر وەسڵی بفەرمووی فیدات بێ ماڵ و سەر
ئەی رووت وەکو ماهە سینەت گوڵە باغە
گەردەنت وەکو پشکۆ جەرگم پڕ لە داغە
ئاگری دڵی من کڵپەی وەکو تەندور
گەر وەسڵێ نەفەرمووی و جودت دەکا خاپوور

کاتێ راپەڕینەکەی شێخ مەحمود شکست دەهێنێ، مامۆستا زەکی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بەم ڕووداوە مێژووییە دەردەبڕێ و هاواری لێ هەڵدەستێ و لە (٢٣)ی مایسی ١٩٣١ ئەم قەسیدەیەی بۆ دادەنێ:-

عــەزیـــزانـــم وەرن کــوردان بکــەن شیــوەن بەیەکجاری
لـەبـۆ ئـەحـوالّمـــان ئیمــڕۆ بکـەیـن تـەدبیـروە یاچاری
لـە بـۆ حەقمان هەڵستابوو ڕەئیسمان یەعنی شێخ مەحمود
لـە مـەیـدانـی وەغـای هـەرلا کە ڕووی تـێ کـردو دای مـاری
هـەتـا شـل بـوو شەڕی کرد و شڕی کـرد دوژمنـی بەدفەڕ
کەچی کوردان هەموو مات بوون نەبوون سابۆی بەغەمخواری
درێـخ و حـەیـفـە بـۆ کـوردان لـەمەولا ئیدعای حەق کەن
نـەیـان دا یـاریـدەی فـرسـەت لـەبـۆ تەحقیقی ئەفکاری
هـەزار رەحمـەت لــە کـوژراوی شـەڕی میللەتی کورد بێ
لـە بـۆ بـەرزی وەتـەن خـوێـن یان لە مەیدانا بووە جاری
ئـەتـۆ شێخم مـەخـۆ غـەم بـەس کەتۆ مەحموودە ئەفعالت
وەکـو سکـە لـەدڵ مـانـدا مـونـەقـقـەش بـوو لـە کرد گاری
ئـەتۆی مـورشیـد لـە بـۆ کوردان دەلیلی سەربەخۆیی بووی
مـەحـامی بووی لە بۆ حەق یان لەگەڵ غەم یان بەغەمباری
نموونـەی گـوردی گـوڕانـی وەکـو شێـری لـە مـەیدانـا
نـەوەك حـەیـدەر نـەوەك خـالید لە دوژمن وا بە کوشتاری
لـە مـەیـدانـی شـەڕا وەك شێـر چریکەت عالەمی هەڵساند
هـەمـوو کـوردان لـە غـەفـڵەتدا هەڵستان کەوتنە هۆشیاری
لـەبـۆ سەرکەوتـنـی کـوردان گـەلێ جوهد و جیهادت کرد
لـە بـەر بێ بەختی کوردان بوو کە بەختی تۆش نەبوو باری

لــە ڕۆژی چــواردەمــی مــایس کــە ڕۆژێـکـی ڕەشـی کــوردە
کــە دەوڕەدرا لـــە گـــەورەی کـــورد و گـیـــرا بـــە غـــەدداری
بنـــۆشـن بــەرگــی ڕەش کــوردان بکــەن مــاتــەم لە ئــەم ڕۆژە
کــە نــەعشو شووم بوو بۆ کوردان مەحوی کرد چاکی ئاثاری
هــەزار جــاران بــە نــەعـلــەت بن وەکــو شیری هــەتــا مــاون
نــەبــوو شــەرمــێ لــەگــەڵ دوژمــن دەدەن دەورە لە شاسواری
بڵێـنـە ئــەم ڕەئـیـســانـــە کـــە ڕۆژی خـــۆشـیـــان فـــەوتـــان
نـــەفــوز و قـــەدر و قـیمـەتیــان فـەرق ناکرێ لە جووتیاری

### هەندێ لە نوکتەکانی مامۆستا زەکی هەناری

باپیری زەکی هەناری کەناوی وەسمان بووە، زۆر نوکتە بازو قسە خۆش بووە، دەڵێن کاتێ ئەمین ئاغا (ئەختەر)ی شاعیر کۆچی دوایی دەکات لەبەر دەرگی ماڵی (ئەختەر)ی شاعیر قوڕگیرابۆوە، کە خەڵکی لە گوندەکانەوە دەهاتن قوڕەکانیان دەخستە سەرسەریان، باپیری زەکی زۆر قۆشمەچی و سوحبەتباز بووە، بێڵێکی بەدەستەوە گرتووە، ئەوەی هاتووە بێڵێکی قوڕی خستۆتە سەری،

- جارێ لە ئاهەنگی ساڵانەی وەرزشی کۆیە کە لە ئەرزی میری کراوە، هەموو ئەشراف و دەوڵەمەندەکانی کۆیە تێدا بەشداربوونە، زەکی هەناری بەکاکە زیادی ووتوە کەمن دەزانم ئەوانەی دێنە ئاهەنگ سەروەتیان چەندە (کاکە زیاد ئاغا) لێی پرسیوە چۆن، ئەویش ووتویەتی بە قونی ئەوێ هێ دەزانم، چونکە هەر کەسێ دەوڵەمەند تربێ، ئەوە زیاتر لەبەری هەڵدەستێ .

- کابرایەکی شەل هەبووە، مامۆستا زەکی ووتویەتی لەسایەی ئەوزاتەوە سەگ لە گەڕەکەمان نەماوە، چونکە دەرۆیشت دەستی شۆڕ دەکردەوە، لەسەگەکان وابێ دەست بۆ بەرد دەبات.
- جارێکیان لە ژوورەوە دانیشتووە مندالەکانی بێ عاریان کردووە، ژنەکەی پێ ووتوە (مالۆس) بۆچی نایەی تەمبێ یان بکەی، ئەویش دەڵێ ئافرەت مەڵێ مالۆس (بڵێ (یەکانە).
- رۆستەم حەوێزی شاعیر بۆی گێڕامەوە، کە مامۆستا زەکی نوکتەی لەسەر کردووە، کاك رۆستەم لەسەر گردی مام جەردیس دادەنیشێ، زەکی هەناری بەوێدا تێ دەپەڕێ و دەچێتە لای مامۆستا رۆستەمی و دەفتەرێکی گەورەی دەداتێ، پێی دەڵێ شیعری تێدا بنووسەوە، ئەو شیعرەشی تێدا بنووسە کە هەجوی منە، پاشان کاك رۆستەم ووتی شیعرەکەم دڕاند و بلاوم نەکردەوە....

## لە شیعرە بلاو نەکراوەکانی زەکی ئەحمەد هەناری

ئەگەر چی ئەدەبەکەمان هەنگاوی فرە مەزن وپێشکەوتووانەی بە خۆیەوە دیوەو قوتابخانەی کلاسیکی ماوەییکە جێهێشتووە لەگەڵ ئەوەشدا ئەدەبی کلاسیکی نرخ وپلەی خۆی دیارە وهەرگیز بە نەمری دەمینێتەوە وڕۆژ بەرۆژیش بەرهەمی بلاونەکراوی تری دەچێتە سەرو بلندو بالاتری دەکات، لەژمارە (٤٩)ی بەیانی بەرێزدا هەندێ لەهونراوە بلاونەکراوکانی مامۆستا زەکی هەناریم خستە بەرچاو کە بۆ مندالانی کوردستانی دانابوو، ئەمجارەش لایەنێکی‌تر لە هۆنراوە کلاسیکیەکانی

شاعیر دەخەمە ڕوو، بەهیوای دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کلاسیکی مان وپەرەپێدانی.

مامۆستا زەکی لە هەرەتی لاوێتیدا وەکو زۆربەی شاعیرە کلاسیکیەکان ئەوین وجوانی ژن دەبێتە سەرچاوەی هۆنراوەکانی و دەکەوێتە جیهانی دڵداریو عیشقەوە، بۆیە لەهۆنراوەی (جوانی) دا ئەم سۆزە دەردەبڕێ ودەڵێ:-

جوانیت هەردەم هەر لەهەبوون بێ
ڕووت درێژی ساڵ وەك لالەگوون بێ
خەیاڵی عیشقت لەسەری ئێمە
هەموو ڕۆژ هەبێ هەر لەزۆر بوون بێ
هەر سەروێ بڕوێ لەناو چەمەندا
لەئاستی باڵات سەری نخوون بێ
چاوێك بە خراپە تەماشای تۆ کات
وەك گەوهەری سوور غەریقی خوون بێ
چاوت لە ڕێگای دڵ فڕاندنا
بۆ جادووکردن خاوەن فنوون بێ
لەهەر کوێ دڵ بێ لەغەمی تۆدا
بژێو بێ ئارام لە هات وچوون بێ
باڵای گشت دولبەر لەهەموو جیهان
لە پێش بەژنی تۆ هەروەکو نوون بێ
دڵێ لە عیشقی تۆدا خالی بێ
لە حەلقەی وەصڵت ڕوو زەرد زەبوون بێ
ئەم لەعلەی لێوت گیانی (زەکی) یە

دوور لـه لێـوانـی پیـاوانی دوون بـێ

بـەڵام زۆری بـێ ناچـێ گوڵی بـاغی هیـوای شـاعیر سـیس دەبـێ و بەئاواتی دڵی ناگاو بەدڵ تەنگی وناسۆرییەوە دەڵێ:-

دڵـم غـەمگینـە خـەو نـاچێتـە چـاوان

کـە هێـور نـابـێ چـاوی پـڕ لـە هێشـان

ئەگەر گشت کەس هەمـووی دڵخۆش وشاد بێ

لـەلای مـن بـەنـدە ژیـن دنیـایـە زیندان

ئـەگـەر شـابـم لـە دنیـادا بە پـوولێك

دڵـم مـەحـزون بـێ چـاوم پـڕ لە گریان

بڵێسەی نـاو هـەنـاسـەم مـەهجەری دڵ

لـەچـاو ئـەڕژێتـە خـوارێ ئـاو بە تۆفان

دڵـی غـونچـەم لـە گـوڵشەن هەرکە پشکوت

غـەمـی پـایـز وەرانـدی دای بـە دۆڕان

کـە بـاڵای ڕاستـەکـەی مـن وا بـە گەنجی

لـەژێـر بـاری غـەمـانـد بـوو بە کۆچان

لـە بـۆ زانینـی تـاڵ وخـۆشـی دنـیـا

هـەزار نـادان وزەکـی مـاوە حـەیـران

مامۆستا زەکی زیاد لە پێویست وێل وعەوداڵی زانست وزانین بووە وەکو مۆمێك بۆ ڕەناك کردنەوەی تاریکی گەلەکەی سووتاوە وهانیداون کـە دوای زانست وزانیـاری بکـەون، کـە بنچینەی شارسـتانیەت وپـێش کەوتنی کۆمەڵە، بۆیە لە هۆنراوەی کە بە نێوی (زانین) دایناوە دەڵێ:-

زەمیـن پـێویستی چەند بە بارانە

زانـیـن بـەم پـێیـە ویستـی گیـانە

بـەتینـە ئـەمـــەی دانـایە وپیاو
زانـیـن دڵـی پیـر ئـەکـاتـن بە لاو
نـەزان تـاریکی یە، چرای زان پێکە
کـێ دەڵـێ زانـا ونەزان وەك یێکە
ئـەتـوێ بە باشی خۆت وگەل بژین
ولآت ببێتـە باغ بۆی بکەی پەرژین
ژیـان خـۆش بکرێ ئێکتـر بناسین
ئـەمەت بۆ پێك دێ بە زانین زانین
لــە کـۆهـەڵـکـرا چـرای زانستی
ڕێ ڕاستـی وهەستی بۆ دیار خستی
کتێبخانەی گشت بەهەشتی مێشکە
مـەلـی گیـــانـت لـەزانیـن خۆشکە

## مەلا عاصی شاعیر دوا دەنگی کلاسیك بوو لە کۆیەدا

کۆیەی مەڵبەندی شیعر و هونـەر، بـەدەیان شاعیر و هونەرمەنـدو ئـەدیبی ناسـراوی پـێ گەیانـدوون، دیوەخـان و تەکیـەو مزگەوتـەکانی شـوێنی بەیـەك گەیشـتنی شـاعیران و ڕۆشـنبیران بـووە، لــە هـەموو سوچـێکەوە ڕوویـان تـێ کـردووە، مـەلا عاصـی شـاعیریش لـە مزگـەوتی گەرموکـدا لەتـەك ئـەرکی ئـاینیدا، خـەریکی شـیعر نووسـین بـووە، لـە شیعردا پەیڕەوی شاعیرانی کلاسیکی نالی و سالم و کوردی کردووە،

شیعرەکانی لە ڕووی کێش و سەرواوە سەر بەڕێبازی کلاسیکن، ووشەی عەرەبی و فارسی زۆری لە شیعرەکانیدا بەکاربردوون، ناوەرۆکی شیعرەکانی بە زۆری بابەتی ئاینی‌یە، جگە لە شیعری نیشتمانی و وەسفی سروشتو دڵداری هەیە. خادیم کە شاعیرێکی ناوچەی کۆیە بووە، لە قەسیدەیەکی دا کە لە یادی شاعیرانی کوردی هۆنیوەتەوە، بەم جۆرە باس لە مەلا عاصی دەکاتو دەڵێ:-

یەکێکی تر لەقەب (عاصی) کە ئەو عاسی لە شەیتان بوو
بە فیعل و قەول و ئەشعاری موتیعی ئەمری ڕەحمان بوو>>(١)

عاصی کەناوی مستەفایە کوڕی بابە ڕەسولی ئەبوبکرە لە ساڵی ١٨٨٥ میلادی لە گوندی خراپەی سەر بە ناوچەی کۆیە لەدایك بووە بۆ خوێندنی وانەی ئاینی خێزانەکەی بۆ سورداش گوێزاوەتەوە، پاشان بەرەو شاری کۆیە هاتوون، بووتە مەلای مزگەوتی قامیش و گەرموك لەسەرەتای شاعیرێتی دا وەکو شاعیرانی کلاسیکی بە شیعری دڵداری دەستی پێ کردووە،

دڵت بردم بەیەکجاری بە نەشئەی خەتی ڕەنگینت
سامی عەقڵ و هۆشت بردم بە خونچەی لێوی شیرینت
دڵت خس[illegible]ومە ناو چاهی زەنخدان و ئەسیرت کرد
پەریشانە بە زنجیری دو[illegible]ۆی زوڵفی چین چینت
زیارەتگاهی عوشقانە ئەم شەوە حەمری خاڵت
فیدای کەعبەی ڕووی تۆ بم ئەوا هاتوومە سەر دینت
لە هیجرانت ئەوا مردم کەوا پەشمینە، ڕووم تێکە

تـــەمـــاشـــای گـولـشەنی ڕووت کەم ببینم گوڵی لە علینت
لــە هــەر لایــەك ئــەوا هــاتــوون سەڤ عاشق لە بۆ دیتنت
منیـش هـاتـووم ئیشـارەت کەم بە گۆشەی چاوی شاهێنت
فـەتـوای کـوشتـنـم بـدە قـوربـان بڵـێ جەلادی چاوت بێ
بکـــا بـــا تیـــرە بـــارانـــم، بـە ڕووی ئـەبـرۆی قـەوسینـت
ســوجــادم لـــە پـــاشی مردن ، وەرە سەر قەبرەکەم جارێك
منیـش کـوشتــەی لێـوی تـۆم و بەیادی عەشقی دێرینت
بڵـێ واهـاتــە پـابـوسم شـەهیـدی تـیـغـی عـەشقـی من
بفـەرمـوون بـا خـــەڵاتی کەن، لە گەنجینەی سین سینت
لـەوێش گـەر بڵێن عـاصی نیشـانـەت گـوا شـەهیـدی تۆ؟
لە جێی دوور ڕادەبوورم ، ئیشـــارەت بۆ پەنجەکـانی خوێنینت[٢]
دیمەنە دڵ ڕفێنەکانی کۆیە ، چیا سەرکەشەکانی هەیبەت سوڵتان و
بـاواجی ، کـانی و کانیاوەکـانی حـەمامۆك و ئۆمـەر خوچـان ، بـاغ و باغەکانی سەرچاوەی ئیلهام و ئەفراندن، سەرنج و هەستی خەڵکی بۆ ئـەو شـارە ڕاکێشاوە، لـە یادمـە مامۆسـتا شـەماڵ صـائب یـادی بـەخێر لەسەردانێکی بۆ شاری حاجی قادری کۆیی، ووتـی پێویستـە ئـەم کۆیـە قەشەنگە دەورە بگیرێت و ناوی لێ بنرێت سەیرانگەی کۆیە:-
عاصی شاعیریش وەسفێکی پڕ لـە سیحر و هونـەر و زانستی ئـەم شارە خنجیلانە دەکات، لەگەڵ ئەوروپا و بەیروت دا بەرامبەری دەکات ، بە نموونەی بەرزی دەچوێنێت.
عــاصمــەی سـولـتــانــی زەوقــە شـاری کۆ بوو هەم نشین
بـۆ علـوم و عــەقــڵ و عـرفــان بـۆتـە یـەکەم شانوشین
حـەمـدو شـــوکـــری پــێ دەوێـتـن لازمـە غـافـل نەبین

شوكری لوتفی خوا بكەین و قەت لە ئەمری دەر نەچین

ئەم مەقامەی دا بە ئێمە گوڵشەنە بۆ عیلم و دین

ئاوی وەك ئاوی حەیاتە وەك بەهەشتە بۆ حەیات

هەر وەكو شاران زەمانە خزمەتێكی گەر بكات

تاجی فەخرە شاری كۆیە بۆ جنوب و رۆژهەڵات

باغ و میوەی شوبهی جەنەت گیایەكانی بۆن ئەدات

نێرگز و لالەو بنەوشە صف بە صف هەم چین بە چین

زۆر مەراقمە تاكو ماوم سەیری ئەورووپا بكەم

تا لە خۆشی وەزعی شاران دیقەتێكی چا بكەم

ئایا وەك كۆیە دەبینم تا ئەوەیش ئەفشا بكەم

گەر بەچاوی خۆم نەبینم زەحمەتە بڕوا بكەم

وەسفی جوگرافی دەلیلە شاری كۆیە یەكەمین

هەر فنونێ لێ ی دەپرسی ئەهلی ئەو لێ بوونەوە

یەك بە یەك لەم شومی جەهلە خاص و عام جوێ بوونەوە

وەك قەدیم گوڵزاری عیلمی زۆر گوڵی گرتونەوە

هەر وەكو غلیمان و حۆری نەوجەوان كۆبوونەوە

وا لەناو باغاتی عیرفان بۆ علوم و گوڵ چنین

شوكروڵلا ئەهلی [illegible]ە بوونە یەكەم بەهرەوەر

لایەق [illegible] نەعەوعە [illegible] شارو چیاو دەشت و دەر

ئەهلی [illegible] ئەهلی غیرەت [illegible] پەرست و باخەبەر

شێری مەستن بۆ شەجاعەت چاو نەترس و پڕ هونەر

مەزرەعەی ئەوصاف و زەوقیان لایەقە بۆ خۆشە چین

گەر نیهایەت خواهی وەصفی زەحمەتە قەت نادرێ

چـونکـه مـەدحـی شـارو ئەهلی قەت بەهیچ کەس ناکرێ
ئـەهلـی دیقـەت بێتـە کـۆیـە فیکـری خـۆی باش ڕاگرێ
تـا بـە چـەرخـی غیـرەت و غـەم جەرگ و ڕیشەی بادرێ
جـێی وەهـای چـونکـە نـەدیوە قەت لە ئەقتاری زەمین
گـەر جبـل لـوبنـان ببینـم بـێ شـك نـەیاغی ئەکەم
هەر بە سەرچاوەی حەماموك جەرگی ئەم من داغ ئەکەم
سـوبح و شـام بـۆ کـەیف وشادی سەیری ناو باغی ئەکەم
زۆر مـەدحـی لێـوەشـاوە بـەرز و پـرلافـی ئـەکـەم
لایـەقە بـۆ شـاری کـۆیـە پێـی بلێـن خـولدی بەرین
مـن کە کۆیـەم سەیری من کەن قەسەرو باغ و مەنزەرەم
سـەیـری کـەن لـەم لالـە زار و ئـەم هەوا ڕوح پەروەرەم
بێـت و لـوبنـان مـن ببینـێ بـێ شکـە دەگـرێ وەرەم
مـن مـوخـازەی زەوقـو خـۆشـی ئەو دەبێتە دێوەرەم
بـابـەتێ زەوقـی دەوێتـن تـاکـو بفـرۆشـێ لـە چین
فـەصلـی زستـان کـۆچـی کـردوو خێـوەتی هەڵدا بەهار
مـەنـزەرەی شـادیو سـرورە دەشـت و چیـاو دێمەکـار
وەك بـەهـەشت ڕازانـەوە هـەر چـار تـەرەفمان لەلا زار
(عـاصـی)یـە بێـرە تـەمـاشـاو نـووکی خامەت بێنە کار
هـەر لـە صـەد یـەك وەسفی دەرخە بێ وەفا با دەرنەچین

لە کۆتاییدا

مەلا عاصی وەکو شاعیرێکی نەناسراو ماوەتـەوە ئەمـەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتەوە کە شیعرەکانی بەکەمی بلاوکراونەتەوە، بـەهیوام ئـەوەکانی

دیوانە تۆز لێنشتوەکەی بەچاپ بگەیەنن یاخود شیعرەکانی بەکەسانی دڵسۆز بسپێرن تاکو لە فەوتاون و لەناو چوون رزگار بێت و بەردێکی تر بچێتە سەر کۆشك و تەلاری ڕازاوەی ئەدەبی کلاسیکی کوردیمان.

**سەرچاوەو پەراوێز:**

١. جەمال محمدامین ، دیوانی خادم، دار الحریە ، بغداد ١٩٨١ ، ل ١٥٥.

٢. ئەم شیعرەم بەهۆی کاك کەریم دەشتی شاعیرەوە بەدەست گەیشت و هەمان شیعر لە ژمارە (٢٦٧)ی هاوکاری ساڵی ١٩٧٥ بلاْوکراوەتەوە.

## شیعرەکانی جۆبار گۆرانی کوردین

شیعرەکانی (جۆبار) کەمۆرکێکی فۆلکلۆرییان بەخۆوە گرتووە، بوونەتە وێردی سەرزاری خەڵکی کۆیە، تیپی مۆسیقای باواجی و گۆرانی بێژانی شارە خنجیلانەکەمان شیعرەکانیان کردۆتە گۆرانی و بەسرود بەقوتابیان دەیلێنەوە. بەتایبەتی هۆنراوەی (راز لە کورد) بەهیوات، بۆم بلێ تۆزە تەمە، بارم پەرێشانە. بابچینە کوێستان، کوردستان،...هتد.

(جۆبار) ناوی جەلالە کوڕی مەلا سەعید عەبدوڵلایە ساڵی ١٩٢٩ لەشاری کۆیە هاتۆتە دونیاوە، هەرهێندە لەقوتابخانە خوێندویەتی تاکو بەچاکی فێری خوێندن و نووسین بووە، پاشان بەهۆی موتاڵەکردنەوە

خۆی پێ گەیاندووەو پەروەردە کردووە، بەهەژاری پێ گەیشتووە، بە پیشەی دوکانداری بژێوی رۆژانەی بەڕێوە بردووە، خاوەنی چوار کچ و سێ کوڕە، هەموویان خێزانی خۆیان هەیە لە ساڵی ١٩٤٩دا دەستی بەشیعر نووسین کردووە، بەتەوژمی دڵداری هەوێنی شیعری کراوەتەوە، چەند شیعرێکی پڕ لە ئەوین و عیشقی نووسیوە، بەشێوازێکی ساکار و سادە لەسەر کێشی پەنجەی خۆماڵی و سەرروای هەمەرەنگ و بە ئاوازی سووك و ئاسان دایڕێژاون، کەخاسیەت و سیمای فۆلکلۆری کوردیان بەئاشکرا پێوە دیارە.

ئەمەش وای کردووە کەشیعرەکان لەلایەن خەڵکەوە ئەزبەر بکرێت، هۆنراوەی (بەهیوات) لەسەر کێشی شەش بڕگەیی هۆنیوەتەوە، کەبەم جۆرە دەست پێ ئەکات.

بەهیوات گیانە
حاڵم پەرێشانە
دڵم واحەیرانە
عاشقی لێوانە
ئەی گوڵی گوڵزارم
بەس بدە ئازارم
رەحمێ بەهاوارم
من کەبرینـدارم
کوشتەی خاڵی تۆم

عـەشقی جەمالی تۆم

شــەو لە خەیاڵی تۆم

شێتـی ویصـالی تۆم

ئـەی گـەلی دۆستانم

گـوێ بـدە داستـانـم

مـن کـە پـەرێشانم

بـەم گـوڵـە حەیرانم

گـەردنـی بـلـووری

کـوڵمـەی لاسـوری

وێڵـم دەکـا دووری

دەم خـەنـە نـاسۆری

پـەرچەمی وەك سایە

ڕوومەتی شەو چرایە

هـەلگـری بـالآیـە

جـوابـی چ بـالآیـە

دیـدەی ئـەم یـارە

نـاسـك و نـازدارە

مـەرهـەمی زامدارە

قـیبلـەیـی جۆبـارە

لـەهۆنراوەی (کیـژە کۆچـەری)دا، شـاعیر هەسـتی خـۆی بەرامبـەر بەکیژێکی قەشەنگ و نەشمیلی کوێستان دەردەبڕێ، کە بە لەنجەی وەکو مۆسیقای و چاوی نێرگزینی شاعیر شێت و شـەیدا بووە، بـەتیری نـازی جەرگی لەتلەت و پارە پارە کردووە، لەم ڕووەوە دەڵێ:-

ئـەی کیـزە کـۆچەری
بـــالاّ سنـــەوبـــەری
ئـەی بوکەکەی کوێستان
تـــۆ پـــەری کـــوێندەری
دەرۆی هـــەوار هـــەوار
بـــەمێـرگ و مێرگوزار
بـۆ بەهەشتی کوێستان
لـەپێش کۆچ و کۆچبـار
بـــەرەنگـی خـورەنگـی
چەند جوان و قەشەنگی
لـەپێشـــەوەی قـــەتـــار
ســـەر کێشی پێشەنگی
زرەی لـولـەو هـەیـاس
لـەگـەڵ بـازنو قرتـاس
مـۆسیقـای رێگـــاتـــە
تـــانـــاو بەفرو رێواس
بـــەدیـــدەی کـلـدارت
بـــەونـیگـــای لـەکارت
جـا چـۆن ئـارام بگرم
بـوەستـم بـەدیـــارت
بـە رووی جوانی شازت
کـەوتـمـە رێـبـــازت
جـــەرگ و دڵ پێکـراوە

بــەدەم نیـێزەی نـــازت

ئـــەی ڕەوت کــارمـامز

ســەر کـوڵم و لێو قرمز

دڵمـت بـاتـــاڵان بـــرد

بــەدوو دیــدەی نێــرگز

جۆبــار وەســفی یارەکـەی دەکـات کـە بـەجل و بـەرگی جـوانی کوردیەوە، پەرچەم و بسك و ئەگریجەی بەسەر شان و گەردەنی پەرش و بڵاوکردونەتەوە:-

یـــارم بـێ شـانــە

پــرچی پـەخشـانە

بـەســەر کــۆڵـوانە

شـاڵـی ســەرشـانە

مــەزەی چـاوانـــە

قیبلــەی لاوانـــە

کـــارمـامزەکەی دەم

چـۆم و ئـــاوانـــە

گیانی سووك و ناسك

چـەنـد خنجیلانە

قـوڵنگـی پێشـەنگی

قـافڵـەی مـەلانــە

خــەرمــانـی گوڵانە

مــەڵبــەنـدی دڵانە

قــەشـەنـگ ڕسکاوی

نـــەخشـی یـــەزدانــە
وێـنـەی بـێ گـەردی
پـــڕخـــاڵــی وردی
لـــەگـــەڵ ملوانەکە
گـــەردەنـــی زەردی
کـەسـەیـــر دەکـەی
بـە بـەرگـی کوردی
نـــــازانـــی دڵــت
کـامیــان بـۆ بردی

جۆبار چەند شیعرێکی بۆ وەسفی جوانی کوردستان نەخشاندووە، بەتایبەتی لەوەرزی بەهاراندا کە سروشت بەرگی هەمەرەنگە دەپۆشێ هەر چەندە سروشت و دیاردەکانی سروشت مایەی خۆشی و شادین، بەلام شاعیر ناشادەو لەداخی گەل و نیشتمانەکەی هەردەم غەمبار و دڵ پڕ لەزامە. لەهۆنراوەی (هەڵسە شۆڕێ)دا دەڵێ:-

هـــەڵسـە شـۆڕێ بـڕوانـە
جـوانـی ئـەم کوردسـتـانە
روو دەکـەیـتـە هـەر لایـێ
بـــەزم و شـایـی و سەیرانە
ئـــەمـــڕۆ وەرزی بـــەهـارە
جــەژنــی یـــار و دڵـــدارە
بـــولبـــول ئـــومێـــدەوارە
بـــۆ بـــاغ بـــڕوا مەستانە
گـــوڵشـــەن سەوزو ڕەنگینە

گشت بەلالەو نەسرینە
خونچەی لەپێ کەنینە
دەوری شتلە ڕەیحانە
هاژەی جۆگەو ڕووباران
جریوەی مەل و هۆزاران
لەرزەی درەخت و چناران
مرۆڤ شادو حەیرانە
کۆمەڵ کۆمەڵ ڕازاون
لەبەرگی بووك و زاوان
کەوتنە دەم جۆم و ئاوان
چەپڵە و سەماو سوڕدانە
دەهۆڵ و زوڕناو ئاهەنگ
ڕەش بەڵەکی شۆخ و شەنگ
لەناو گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ
کەوتنە کار لەم باغانە
جیهان مەست و مەدهۆشە
تەنها جۆبار خامۆشە
زامی دڵی لە جۆشە
هەمیشە لە گریانە

شاعیر وەسفی کوێستانی کوردستان دەکات کەلەهاوین دا چیا سەرکەشەکانی کوردستان بەرگی سپی فرێ نەداوەو لەدامێنی چیاکاندا کۆچەرەکان هۆبەهۆبە دەواریان لێ هەڵداوە، کەدیمەنێکی یەکجار دڵ ڕفێنە.

بـابچینه کوێستان بۆ گەشتی ئەم ناوه
جوانی جیهانی خوا بەم شوێنەی داوه
لــه چلـەی هـاوینــه نەوبەهار ببینه
قـەندیـل مەندیلــی هەر فڕێ نەداوه
ئەم شوێنه جوانه جێگەی کۆچەریـانه
هـۆبــه بـەهۆبه ڕەشمـاڵیان هەڵداوه
تــا چـاو لێی دیاره چیمەن و گوڵزاره
پـڕ جۆگـەو کانی و ڕووباری بەفراوه
بلـوێـری شوانــی، لـەبـەرزی تەلانی
کیـژ لــەســەر کــانی دێنێته سەماوه

شـاعیری لـەهۆنراوەی (کوردسـتان)دا ڕۆڵـی گرنگـی کوردسـتان لـه ڕووی ئابوورییەوه دەردەخا کە چ سامان و بەهایەکی پـڕ بـەنرخی هەیـه نـەك لەکوردسـتاندا بـەڵکو لەهـەموو جیهانـدا بیـێ وێنەیـه لـەم ڕووەوه دەڵێت:

کـوردستــان چەنـد شیرینه
جـەنـەتــی ڕووی زەمـیـنــه
قــەومـی دڵ صاف و پـاکه
لــەنــاو عــالــەمـدا تاکه
کــوردستــان چەند شیرینه
گــەنجــی کوردی پڕ هونەر
هــەمووی لایــەقی سەروەر
لــەم خــاکه هاتوونه بەر
کـوردستــان چـەنـد شیرینه

لاوانـــی خـــوێـــندەوارن

بـۆ ئـــەم خـاکە غەمخوارن

رەحـــم بـــەری هـــەژارن

کـــوردستـــان چەند شیرینە

خـــوایـــە هـــەر پایەدار بێ

ئـــەم قـەومە بەر قەرار بێ

نـــاحـــەزی شـەرمـەزار بێ

کـوردستـــان چەنـد شیرینە

خـــاکـــی مـــەردی مـەردانە

پـیشـــەی شێـــری زەمـــانـە

مـــەنبـــەعـــی شـادومـــانـە

کـــوردستـــان چەند شیرینە

مـستـــەحـــەقـە بـــێ ژمـــار

مەدحی بکە تۆ ئەی جۆبـار

بـۆ خـــاکـــی وا زیـڕ نیگـار

کـوردستـــان چەند شیـرینە

جۆبـــار لــەهۆنراوەی (راز لــە کــورد)دا باســی گەڵــە هــەژار و بــێ دەرەتانەکەی دەکات لەنێو خۆدا خەریکی دووبەرەکی و نـاکۆکین داوایـان لـێ دەکات کەیـەکبگرن و راپـەڕن و هەڵمـەت بەرنـە سـەر داگیرکـەران و لەژێر چنگی ناحەزان رزگاربن.

میـلـلـەتـانـی رووی زەمیـن روویـان بەرەو رووناکی‌یە

میـلـلـەتـی ئێمـەش لـەتـاریکـی، کـەسـادی تاکی‌یە

غۆلی ناو دەشت و چیاکان بوون بەخاوەن عیلم و فەن

دەردی بێ هۆشی لەناو کوردان دەڵێی زگ ماکییە
هەر خەریکی بوغزو قین و فتنە بازی ناوەخۆن
تا وەهابن هەر ژیانتان ژانو پڕ غەمناکییە
ڕۆستەمن بۆ خۆ بەخۆی و کوشتنی یەکتر بەلام
مێگەلی دەست دوژمنن بەم مردەنی و هیلاکییە
پشت لەیەکو بەر لە بێگانا لەسەریان بوویتەو خوو
وادەزانن گەر وەها بن کردەوەی وا چاکییە
بەسیە با هەڵمەت بەرین ئەم نالەبارەیە لابەرین
نیشتیمانی بەش خوارومان چاوەڕێی چالاکییە
کەی دەبێ ئەم جۆرە ناپاکییە لەناو پاك بێتەوە
زەحمەتە (جۆبار) مەگەر ئەم ئاخە بۆ ژێر خاکییە
تێبینی
بەشێکی شیعرەکان لە ئەرشیفی بەندەو بەشێکی تری لەدەستنووسی شاعیر وەرگیراون.

## (کەڵەشێر)ی جۆباری شاعیر

جیهانی منالآن جیهانێکی پڕ سەیر و سەمەرەیە، پڕ تەمتومان و ئالۆزە، جیهانێکە نەسەرەتاو نە کۆتایی دیار نییە، جیهانێکە چەند مەزنە ئەوەندەش چووکەڵەیە، ئەفسووناوی و خەون و خەیالآتە، وڵاتە پێشکەوتوەکانی ئەوروپا زیاد لە پێویست ئاوڕیان لەم جیهانە جەنجاڵە داوەتەوە، بەشێوەیەکی زانستی و مەوزوعیانە لەگەڵ ئەم نەوەیە مامەڵە دەکەن و هەموو دەرگاو پەنجەرەیەکیان بەڕوویان داوالا کردۆتەوە.

بەشێوەیەکی پەروەردەیی هەڵس و کەوت و ڕەفتار دەکەن ویست و ئارەزووەکانیان بەسانایی جێبەجێ دەکەن، بەوپەڕی دڵسۆزی و

لەخۆبردنــەوە ڕێزیــان دەگــرن و پلەوپایــەی تایبــەتی یــان دەردەخــەن، قوتابخانــەو خێــزان درێغــی ناکــەن لەبەرزکردنــەوەی ئاســتی ڕۆشــنبیری منداڵاندا، بەدەیان کتێبخانەو یاریگای منداڵانیان چێ کردوون، ئەوانە لەماڵــەوە بــەدەیان چیرۆك‌و ئەفســانەیان بــۆ دەگێڕنــەوە، بەســینگ فراوانییــەوە وەڵامــی هــەموو پرســیارێکیان دەدەنــەوەو لــە تــاوتۆکردنی دیاردەکــانی سروشــت و کۆمــەڵ و کەونــدا هاریکاریــان دەکــەن، شــاعیری تایبەتی و کتێبخانەی تایبەتی‌یان بۆ ڕەخساندووون، ڕۆشنبیرانی کوردیش لــە ئــاوارەیی دا قۆڵیــان لــێ هــەڵمالیوەو لــەم بــوارەدا بــەدەیان نامیلکــەو کتــێبی منــداڵانیان وەرگێــڕاون لــەدوای ڕاپــەڕین لەکوردســتانی باشــووردا چەندین گۆڤار و نامیلکەیان بەچاپ گەیانــدوون، کەمایــەی خۆشــحاڵییە، بەڵام هێشتاش وەکو پێویست نی‌یە، چونکە جۆری مامەڵەکردنیان چ لــە قوتابخانەو چ لەماڵەوە پێویستی بەگۆڕان و پەرەپێدانە.

جەلال جۆبار کــە شــاعیرێکی شــەعبی دەفــەری کۆیەیــە شــیعرەکانی مۆرکی فۆلکلۆریان بەخۆوە گرتوون لەمیانی شیعری منداڵانیشــدا چــەند شیعرێکی بە زمانێکی ساکارو بەکێش و ســەرواى خۆمــاڵی بــۆ نووســیون، بەزمانی پەلەوەر منداڵانی کوردستان هۆشــیار دەکاتــەوە کەلەخــەوی بــێ ئاگایی وریا بینەوەو خۆیان بە چەکی زانست و زانیاری پــەروەردە بکــەن و لــە خــەبات و کۆششــی کــردن بــەردەوام بــن تــاکو کوردســتان ئــازاد و سەربەست بێ.

کەڵەشێر

ئــەی کەڵــەشێری پۆپنــە لار و جوان
ئەی هاو دەنگیەکەی بێ دەنگی شەوان
ئــەی هــاوڕێی تەنیا و شەوگار درێژان

ئەی کاتژمێری خولیاو بێ خەوان
لەشەوە زەنگی تەنیا و بێ دەنگی
منی ئاوارە هەرتۆم هاودەنگی
لەداخی کوردی نوستوو بەجێ ماو
لە قافڵەی گەلان بە بار لاسەنگی
بەدەنگی بەرزت دەسا بخوێنە
ئەم گەلەم لە خەو بۆ راپەڕێنە
بڵێ با هەڵسن ئەوا رۆژهەڵات
خۆ ئامادەکەن هەتا گەلێنە
گەلێ مافی خۆی بۆ خۆی نەستێنێ
مافی پێ نادرێ با دانەمێنێ
بڵێ بە کوردی بێ حاڵ و ماڵم
با هەڵسێ ماڵێك بۆ خۆی پێك بێنێ

هەر لە خۆرهەڵات هەتا خۆر ئاوا
هەرکورد بەش بەش و وابەش خوراوە
بۆ خواستی تایبەت لەهەندێ لایەن
دەرگای ئازادی لێ داخراوە
کوردستان وەکو کچێکی بووکە
جوانیەکەی نەوتی کەرکووکە
چاو برسی چاویان زۆر تێ بڕیوە
گەر نەیپارێزین بۆ ئێمە سووکە
هێزی‌یەك بوون و یەك‌دەست‌ومەبەست

قـەلای هۆشیاری و بەرگری بەهەست
یـەك چـارە پێـویستـە لەم قۆناغەدا
لـەگـەڵ خـەبـاتـی درێژ و نەوەست
هـەمـوو سەربـازی یەك فەرماندە بن
لــە ڕێی یەك ئامانج هەموو بەندە بن
جیـاوازی نــەبێ لـەنـاو ئەم و ئەو
لــە بیـروڕادا یـەك مـەزنــدە بـن
ڕێــز لــە دەستی پیس پاك بكرێتەوە
نیـازی چـەوت لـە ڕا دوور بخرێتەوە
هەموو هەوڵێك بەس بۆ كوردستان بێ
بـۆ دوور و نێـزیـك كـۆبكـرێتــەوە

لـە ڕێـوی‌و كەڵەشـێردا، شـاعیر ئامۆژگـاری منـداڵانمان دەكـات كـە لەژیانـدا وریـا بـن‌و كەسـانی فێڵبـاز فریویـان نـەدەن‌و، شـاعیر ڕێـوی بەڕەمزی فێڵباز لەقەڵەم دەدات كە هەردەم خەریكی داو نانەوەیە.

ڕێوی‌و كەڵەشێر

لــە گـونـدێكـا كـە چۆڵ كرابوو
سـەگ‌و كـەڵـەشێرێـك مــابوو
سەگ لەحەوشەو ئەو لـەسەردار
بــانگـی دەدا بــەچـوار كەنـار
ڕێــویــەكــی بــرســی لـەم ناوە

گـوێـی بـەم دەنگـە زرنگـاوە

گـوتـی خودا دای با بۆی بڕۆم

بـەڵکـو جەمێکی خۆش دەخۆم

بـەپـارێــز هــات بـەلایـەوە

تــا گـەیشتــە بــن پـایـەوە

گـوتـی ئـەی مـامـۆستای تەمام

هـاتـووم کـە بـۆم ببیە ئیمام

ئـەوا بـەم دەنگـە خـۆشـەوە

بـەم بـانگـە پـڕ لـەجۆشەوە

وا بـانگــت داو لــێبوویتـــەوە

لای خـوا قـەت وون نـابێ ئەوە

وەرە خــــوارێ لـــەســــەرداری

هـەتـــاکــــو نـوێژ ماوە جارێ

پـێـش نـوێـژیـەکـەشم بۆ بکە

خـێـرە بـەقــەد چوونە مەکە

کـەڵـەشێـر گـوتـی ئـەی ڕێوی

دەتــۆش لەوحەوشەی ئەودیوی

یـەکێـکـی لـێیـە هــاورێــمــە

بـا ئــەویـش بێت بۆلای ئێمە

ڕێـوی کـە سـەری بـردە ژوور

ســەگێکی گەورەی دیت لەدوور

لـەوحـەوشـەدا پـاڵکـەوتـووە

بـــەخـەو خـەریکەو نووستووە

بـەبـێ هـەسـت بـۆی کشایەوە
هـەڵات ئـــاوڕی نـــەدایـــەوە
ئـەنـجـامـی ئـەم شـەشو بێشە
مـسـت گـەڕایـەوە لـەدرێـشـە[*]

[*]پەندی کوردی دەڵێ: مست لە درێشەی دەگەڕێتەوە

### تاوێك لەگەڵ شەپۆلی غەمی ڕێبواردا

ڕێبوار هـەر وەکو لەنازناوەکەیدا بـەدەر دەکـەوێ، کەسـێکی دوورە پـەرێزو لاتەریکـە لـەبواری شـیعرو ئەدەبـدا، وەکـو پێویسـت خـۆی بـە خوێنەران ئاشنانەکردووە، هەر چەندە ماوەیەکی زۆرە شیعر دەنووسـێ، بـەڵام وەکو سـەربازێکی نەناسـراو ماوەتـەوە، ماوەیـەکی زۆرە دەیناسـم، کەچی بەرێکـەوت بـۆم دەرکـەوت کـە شـیعر دەنووسـێ، جـا منـیش لای خۆمـەوە دەنگـی ئـەم شـاعیرە ناسـکە بـە خوێنـەران دەگـەێنم بـەهیوای ئەوەی کەلە فەرامۆش کردن رزگاری بکەم و بەعاشقاتی شیعرو ئـەدەبی بناسێنم.

(ڕێبوار) ناوی (صابر)ە، کوڕی حەمەد عەلی ئەحمەدە لە گوندی سووسەی سەر بە قەزای کۆیە، لە بنەماڵەیەکی جووتیاری هەژار و کورد پەروەر لە ساڵی ١٩٥٧ چاوی بە دونیای جوانی دا هەڵهێناوە، باپیری خەڵکی گوندی (باقڵین)ی نێوان ئالیان و ئەشکەوت سەقایە سەر بەناحیەی شۆڕشەو لە عەشیرەتی (گەرد)ینە،، تەمەنی پێنج ساڵان بووە کەباوکی لەناوچەی هیران گیراوە دوای ئازار و سزدانێکی زۆر لە ١٩٦٢ کۆچی دوایی دەکات، ڕێبوار لەتەمەنی دە ساڵیدا چوّتە قوتابخانەی سووسەی سەرەتایی پۆلی شەشەمی تەواو کردووە، لەپاش نسکۆی ١٩٧٤دا ئاوارەی ئیران بووە، لەوێدا فێری زمانی فارسی بووە، لە ساڵی ١٩٧٦ بۆ کوردستانی باشوور گەڕاوەتەوە، تا پۆلی پێنجەمی ئامادەیی لە قوتابخانەی شەوانی هەولێر بەردەوام بووە.

نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکات چونکە بۆ خزمەتی سەربازی راپێچ کراوە، لەساڵی ١٩٨٣وە لە کۆلێژی ئاداب وەکو فەرمانبەرێك دامەزراوە، تاڵی و سوێری زۆر چەشتووە، لە شیعرەکانیدا رەنگیان داونەتەوە، بابەتی شیعرەکانی دڵداری و جوانی سروشت و نیشتمان پەروەرییان بەخۆوە گرتوون، لەسەر کێشی خۆماڵی داڕێژراون، بەشێکی زۆری شیعرەکانی نەتەوایەتین دژی دەرەبەگ و داگیرکەرانی کوردستان نوسراون، لەپاش راپەرینی ١٩٩١دا زەنگی ئازادی بەرز دەکاتەوە بەناوی (منیش گەلێکی چەوساوەم) دەڵێ:-

منیش گەلێکی چەوساوەم
خاوەن خاك و خاوەن مێژوو
کوردی ئازا و نەوەی کاوەم

ساڵە ها بوو تاکو دوێنێ
لەناو مەرگە ساتا ئەژیام
ئۆخەی ئەمرۆکە ئازادم
سارێژ بوو گیانی پڕ زام

ڕێبوار کاریگەری شیعرە شۆڕشگێڕەکانی حاجی و بێکەسی شاعیری بەسەرەوەیە، بۆیە هاتووە شیعرێکی بێکەسی شاعیری تێ هەڵکێش کردووە:-

لاوانی وەتەن غیرەتێ بکەن
(بەرەو پێشکەوتن تاکو پێ بگەن)
دەی هەستن لەخەوا بەسەر چوو شەو
(بۆ گەل و وولات ببن بە پێشڕەو)
ئەما زەمانی جەهل و نەزانی
خامە هەلگرن بۆ کامەرانی)
ئەمرۆ فرسەتە رۆژی هیمەتە
(ساتی پچڕانی زنجیر و پەتە)
بەعیلم و سەنعەت بەرز ئەبێ میللەت
(چونکە زانستە لائەبا زیللەت)
عالەم هەمیشە خەریکی ئیشە
(ئێوەش وەك ئەوان بیکەن بە پیشە)
ئیش کەن بەمەردی بەدەست و بردی)
جیاوازی نەبێ درشت ووردی
یەك دڵ و دەم بن تا رۆژی مردن
(دژی بێگانە و دۆستی یەکتر بن)

لاوانــی وەتــەن غیــرەتــێ بکــەن
(بـــاش هـەڵکەوتووە لـەدەستـی مەدەن)
لـەهۆنراوەی (بـەیان)دا وەسـفێکی جـوانی سروشـت و دیاردەکـانی دەکـات و لەگـەڵ بابـەتی نیشـتمان پەروەریـدا ئـامێزی دەکـات لـەم گواستنەوەیدا لاسایی پیرەمێردی شاعیری پێوە دیارە:-

ئـەستـێـرەی بـەیـان ئەدرەوشێتەوە
لـق و پـۆی گـوڵان ئـەلـەرێتــەوە
خـونـــاوی بـــاران ئـەچۆڕێتــەوە
دەنگــی بـولبـولان ئـەزرینگێتـەوە
شـەفـەق و زەردەی ئـەدا لەسەر کەل
ئـەدا لـە درەخت و ئەیکا بە هەیکەل
نـاونیـشـانـە بـۆ هـەستـانی گەل
تـا بکـا خـەبـات لەدەست نەدا هەل
خـۆشـە بـەیانیـان شنەی بای شەماڵ
بـدا لـەداری نێـوان حـەوشەی مـاڵ
پـەرچـەم لابـدا لـەسـەر ووردەخاڵ
چـەنـد خۆشە خەوی نزار و قەدپاڵ
ئـەستـێـرەی بـەیـان کـاتێ دێتە دەر
لەسەر لووتکەی کەل ئەبەستێ لەنگەر
ئـەدرەوشێتـەوە وەك دوڕ و گـەوهـەر
منـیـش لـە ڕێگـادا دائەنێم سەنگەر
تـەنهـا لـە ڕێگــا کـەمینـم نـاوە
پـەرێشــانـم و هـۆشـم نـەمـاوە